# ئەزموونی من

## دە بنەمای لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

فهد سالم الكندري

# ئەزموونی من

## دە بنەمای لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

وەرگێڕانی:
کاروان ڕەشید محي الدين

**بەرهەمی ناوەندی ئەویندارانی قورئان**

ناوی کتێب: ئەزموونی من

دە بنەمای لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

ناوی نووسەر: فهد سالم الكندري

وەرگێڕانی: کاروان ڕەشید محي الدين

تایپ: بـاوکـی ژیـوان

پیت چنین: مۆردان نامق صابر

دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٢

چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١١٠)ـی ساڵی (٢٠٢٢)ـی پێ دراوە.






ئەویندارانی قورئان

**ناوەندی ئەویندارانی قورئان**

بۆ فێرکردن و لەبەرکردن و سندی قیرائات
بە ئۆنلاین





**ناوەندی ڕێنوێن**

 07511408868 - 07501269689

 hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

 سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

## پێشکەشە

**بە باوکی کۆچکردووم (خوای گەورە لێی خۆش بێت)**

باوکـی خۆشەویسـتم زۆر لەگەڵـم دا مانـدو بـوو... ئـەو خـۆی تەرخـان کـرد لەپێنـاو ئـەوەی قورئـان لەبـەر بکـەم.

بابە گیان... هەموو سۆزو خۆشەویستییەکم بۆ تۆیە ...

داواکارم لـە خـوای گـەورە، لەبەرانبـەر هـەر پیتێکـی قورئانـدا کـە نوسـیومە یاخـود خوێندوومەتـەوە، یـان فێری هـەر کەسـێکم کردبێت، بیخاتـە سـەر تـای تـەرازووی کـردەوە چاکەکانـت، وە پاداشـتی هەموو ئـەو کەسـانەش بداتـەوە کـە بەهـۆی منـەوە قورئانیـان خوێندوەتـەوە یاخـود لەبەریـان کـردوە، یـان فێـری خەڵکیـان کـردووە.

**بە دایکی خۆشەویستم (خوا بیپارێزێت)**

دایکـی شـیرینم شـەونخونی زۆری لەگەڵـدا کێشـام و لـە خزمەتیـدا ئایەتەکانـم لەبـەر دەکـردو دووبـارەم دەکردنـەوە، ئـەو بـە بەردەوامی پاڵپشـت و هانـدەرم بـوو.

# پێڕست


| بەند | بەش | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |
| بەندی یەکەم<br>بنەما و نهێنییەکانی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز | بەشی یەکەم<br>بۆچی قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەین؟ | ١٣ |
| | بەشی دووەم<br>دە بنەمای لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز | ٢٩ |
| | بەشی سێیەم<br>پلانی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز | ٥٧ |
| | بەشی چوارەم<br>چۆن قورئان لەبەر بکەم؟ | ٧١ |
| | بەشی پێنجەم<br>منداڵان و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز | ٩١ |

# پێڕست


| بەند | بەش | لاپەڕە |
|---|---|---|
| بەندی دووەم<br>ڕامان لە قورئان | بەشی یەکەم<br>بەگەورە گرتنی قورئان لە دڵەکاندا | ١٠٣ |
| | بەشی دووەم<br>ڕامان لە قورئان؛ پێناسەکەی، گرنگییەکەی | ١١٣ |
| | بەشی سێیەم<br>هۆکارەکانی ڕامان و وردبوونەوە لە قورئان | ١٣١ |
| | بەشی چوارەم<br>کۆسپ و لەمپەڕەکانی بەردەم ڕامان لە قوررئان | ١٤١ |
| | کۆتایی | ١٤٧ |
| | خشتەکان | ١٤٩ |

# پێشەکی

برایان و خۆشەویستانم...

الحمد لله الذي أنزل على عبده الكتاب ولم يجعل له عوجا، والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين، نبينا وحبيبنا وقدوتنا وقرة أعيننا محمد(ﷺ) وعلى آله وأصحابه أجمعين.

لە ژیانمدا ئەزموونی جۆراو جۆرم تێپەڕاندووە، بەڵام تەنها یەک لەو ئەزموونانە گۆڕانکاری گەورەی لە ژیانی مندا کرد و خۆشبەختی پێ بەخشیم لەگەڵ ئەوەی کە تەمەنم زۆر کەم بوو، بەم هۆکارەوەشەوە شێوازی هەڵسوکەوت و مامەڵەی خەڵکی لەگەڵمدا گۆڕا و ڕێز و خۆشەویستی زیاترم لەناو خەڵکیدا بەهۆیەوە بەدەست هێنا، ئەزموونەکەشم لەبەرکردنی هەموو قورئانی پیرۆز بوو.

چەند ڕۆژێکی خۆش بوو کاتێک لەگەڵ مامۆستاکەمدا لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین، کە هەواڵی کۆتایی هاتنی لەبەرکردنی هەموو قورئان لە باوکم بشارمەوە و هەتا دواتر وەکو موژدەیەک بیکەمە دیاری بۆی، ئێستاش زۆر بەجوانی ئەو چرکەساتانەم لەبیرە، کات کاتی نوێژی {عەسر} بوو، منیش کۆتا ئایەتەکانی قورئانم بەلەبەر بۆ مامۆستاکەم دەخوێندەوە، دواتر بەخێرایی لە مزگەوتەوە بەرەو ماڵ گەڕامەوە تا ئەو موژدە خۆشە بدەم بە باوکم و پێی بڵێم هەموو قورئانی پیرۆزم بەتەواوی لەبەرکردوە! لەو ساتەدا باوکی ڕەحمەتیم

لە ژوورەکەی خۆی دانیشتبوو، دەرگاکەی پێوە دابوو، کارێکی قورس و دژوار بوو کاتێک باوکم لەژوورەکەیدا پشوی بدایەو من یان یەکێک لە براکانم بچووینایەتە ژوورەوە بۆ لای، بەم کارە زۆر تورە دەبوو بەتوندی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردین، بەڵام ئەو ڕۆژە من خۆم پێ نەگیراو دەرگاکەم کردەوەو چومە ژوورەوەو پێم ووت: (باوکە گیان.. موژدەت لێ بێت هەموو قورئانی پیرۆزم لەبەرکردو ئێستاش لەلای {مامۆستا ڕەشاد} تەواوم کرد)، باوکی ڕەحمەتیم خۆی پێ نەگیراو دەسبەجێ فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتنە خوارەوە!؟ بەڕێزان هیچ کات لە ژیانمدا باوکم نەبینی بوو فرمێسک بڕێژێت جگە لەم کاتە نەبێت کە بەمووژدەی لەبەرکردنی هەموو قورئانەوە چوومە خزمەتی، دوای کەمێک باوکم ڕووی تێکردم و ووتی: (کوڕی شیرینم ئەی فەهد، ئاواتەکەم هاتە دی و هەست دەکەم دونیاو دواڕۆژم بەدەست هێناوە).

بێگومان ئەمەی باسی دەکەم هەستێکی هێندە خۆشی بە من و باوکم و خێزان و هاوڕێکانم بەخشی کە پێناسە ناکرێت... لەبەرکردنی هەموو قورئان خۆشی و شادییەکی ئەوتۆ بوو، کە زۆر کەسی دڵخۆش کرد... دەزانم تۆش کاتێک ئەم وشانە دەخوێنیتەوە هەست بەخۆشی و شادی دەکەیت و ئەم ڕووداوە زەردەخەنە دەخاتە سەر لێوەکانت! دەزانن هۆکاری ئەم دڵخۆشییە چییە؟

چونکە ئەم قورئانە پیرۆز و بەرز و عەزیزە و... بەبێ گومان کەسانی لاواز و کەم تەرخەم توانای بەدەسهێنانی ئەم نیعمەتەیان نییە، لەبەرئەوە هەست بەخۆشی دەکەیت کاتێک ئەبیستی کەسانێک قورئانیان لەبەر کردوە.

پرسیارێکت لێ دەکەم و دەمەوێ بەڕاستی وەڵامم بدەیتەوە: ئایا ئومێدت هەیە هەموو قورئان لەبەر بکەیت؟ ئایا دڵخۆش دەبیت کاتێک کوڕەکەت یان کچەکەت هەواڵی لەبەرکردنی هەموو قورئانت

پـێ ڕابگەیەنێـت؟ دەزانـم زۆربـەی لـە وەڵامـدا دەڵێـت: جـا کـێ هەیـە حـەز بـەوە نـەکات، کـە خـۆیی و منداڵەکانـی قورئـان لەبـەر بکـەن، بـەڵام ئـەم ئاواتـە نـەک کارێکـی قورسـە بەڵکـو تەنانـەت شـتێکی ئەستەمیشـە...

نەخێـر ڕاسـتەقینە بـەو شـێوازە نییـە، سـوێند بەخـوای گـەورە لـەم کتێبـەدا بـۆت دەسـەلمێنم ئەمـەی باسـی دەکـەم قـورس و نارەحـەت نییە و.. دڵنیـات دەکەمـەوە ئەمـە ئاواتێکـە دەتوانی بیهێنیتە دی، بەو مەرجەی پشـت بەخـوای گـەورە ببەسـتیت و، دواتریـش ئـەوەی کـە پەیوەنـدی بـە خـودی خۆتـەوە هەیـە حـەزو هەوڵـدان و پێداگری و بەردەوامیتـە بـۆ لەبەرکردنـی قورئانـی پیـرۆزو، تاقیکردنـەوەی ئـەم نەخشـە ڕێگایـەی کە گەورەترین تاقیکردنەوەیەکە لـە ژیانتـدا ئەنجامـی دەدەیـت.

بـەردەوام بیـری وشـەکانی باوکـم دەکەمـەوە، کـە پێـی وتـم: کوڕەکـەم... کاتێـک تـۆ لەبەرکردنـی قورئانـی پیـرۆزت هەڵبـژارد و بەکـردەوە جێبەجێـت کـرد، هـەر تەنهـا ژیانـی تـۆ نەگـۆڕا، بەڵکـو لەگـەڵ تـۆدا سـەرتاپا ژیانـی ئێمـەش گـۆڕا.

کاتێـک قورئـان لەبـەر دەکەیـت ئینجـا هەسـت بەتـام و چێـژی ڕاسـتەقینەی ژیـان دەکەیت، پەروەردگار خۆشـبەختییەکی لەڕادەبەدەرت پـێ دەبەخشـێت کاتێـک خـۆت و منداڵەکانـت قورئانـی پیـرۆز لەبـەر دەکـەن، ئەمـەش بەڵێنـی خـوای گەورەیـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ النَّحل: ٩٧. بێگومـان ئـەو بەڵێن و پەیمانـەی پـەروەردگار، کـە لـەم ئایەتەدایـە بـۆ هەمـوو کار و کردەوەیەکـی چاکـە، جـا دەبـێ حاڵـت چـۆن بێـت کاتێـک ئـەو کـردەوە چاکە لەبەرکردنـی قورئانـی پیـرۆز بێـت؟! کەواتـە کەمتەرخەمـی مەکـە و دوا مەکـەوە و پەلـە بکـە بـۆ لەبەرکردنـی قورئانـی پیـرۆز بەئامانجـی بەدەسـهێنانی بەختـەوەری.

هەوڵ دەدەم ئەو نەخشە ڕێگایەی خۆمت پێ بگەیەنم، بەئومێدی ئەوەی ببێتە ڕێ نیشاندەرێک، تا بەئاسانی قورئانی پیرۆز لەبەر بکەیت، من لێرەدا (١٠) یاسای سەرەکیم بۆ هەڵبژاردوویت و، جێبەجێ کردنی ئەم یاسایانە لەسەر ئەو کەسانە واجبە کە قورئان لەبەر دەکەن، دواتر بۆ لەبەرکردنی هەموو قورئان سێ نەخشەی ترم بۆ داناویت، تۆی خۆشەویست سەرپشک کراویت، لەو سێ نەخشەیە کامیان هەڵدەبژێریت، دەتەوێ لەماوەی چەند ساڵدا قورئان لەبەر بکەیت؟ لەماوەی ساڵێکدا لەبەری دەکەیت؟ یان بەماوەی سێ ساڵ؟ یاخود بە پێنج ساڵ هەموو قورئان لەبەر دەکەیت؟

پاشان باسی ڕێگاکەی خۆم دەکەم و هانی خەڵکی دەدەم ئەو ڕێگایە هەڵبژێرن؟ بێگومان لەو ڕێگایەدا چەند نهێنی یەک دەخەمە ڕوو، بۆ چۆنیەتی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، دواتر ئاماژە بەباتێکی گرنگ دەکەم، کە زۆر لە {حافظ قورئان} کان پشتیان لێ کردوە و لێی بێ ئاگان، ئەویش تێرامانە لە قورئانی پیرۆز لە کاتێکدا قورئان بۆ تێرامان و لێتێگەیشتن دابەزیوە بۆمان.

بەڕێزان: قورئانی پیرۆز دیاری و بەخششی خوای گەورەیە کە دایبەزاندوە بۆ بەندەکانی هەتا ببێتە توێشویەک بۆیان، دەی کەواتە ئێوەش دەست بەقورئانەوە بگرن، با ئەو هەموو پاداشت و بەرەکەتەی کە تیایدایە ببێتە توێشوویەک بۆتان، پێویستە ئەو ڕاستییەش بزانین کە قورئان تکا کارە بۆمان لە ڕۆژی دوایی دا.

داواکارم لەخوای پەروەردگار ڕێنمونیم بکات و لێم وەربگرێت

براتان/ فهد سالم الكندري

# بەندی یەکەم

# بنەما و نهێنییەکانی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

## بەشی یەکەم

## بۆچی قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەین؟

قورئانی پیرۆز: فەرمایشتی خوای گەورەیەو دابەزێنراوە بۆ سەر پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ، کە لە دوو توێی پەڕاوێکدا نوسراوەتەوە و نەوە بەنەوە بە تەواتور نەقڵ کراوەو بەئێمە گەیشتوەو، هەرکەس بیخوێنێتەوە بە پەرستش و بەندایەتی بۆی دەنوسرێت لەلای خوای پەروەردگار.

قورئان گەورەترین نیعمەتەو بەهۆیەوە پەروەردگار منەتی خۆی ڕژاندوە بەسەر ئوممەتی پێغەمبەری ئازیزدا(ﷺ)، قورئان ئەو نور و ڕوناکییەو ڕزگارکەری مرۆڤەکانە و لە تاریکییەوە دەیانبات بۆ ڕووناکی و، ئەوانی لە بەندایەتی بەندە ڕزگار کرد و دووبارە کردنییەوە بە بەندەی پەروەردگار، وەک دەفەرموێ: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ۝﴾ إبراهيم: ١.

واتە: ئەمە پەڕاوێکە ناردومانەتە خوارەوە بۆ تۆ {ئەی محمد ﷺ} بۆ ئەوەی خەڵکی ڕزگار بکەیت و لە تاریکییەکانەوە بیانبەیت بۆ ڕوناکی {لە تاریکی بێباوەڕییەوە بۆ ڕوناکی باوەڕو ئیمان} بەئیزنی پەروەردگاریان {ڕێنمونییان بکەیت} بۆ ڕێگای {خوای} بەدەسەلات و زاڵی سوپاسکراو.

ئەمە ڕاستییەکی ڕون و ئاشکرایە کە ژیانێک بەبێ قورئان پێی ناوترێت ژیان، ئێمە بەبێ قورئان لەناو تاریکی و نەفامیدا دەژین وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ

وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ..﴾ الأنفال: ٢٤.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە وەڵامی خواو پێغەمبەر(ﷺ) بدەنەوە کاتێک بانگتان دەکەن بۆ لای ئەو {ئاینەی} کە زیندوتان دەکاتەوە...

(يُحْيِيكُمْ): بەواتای ئەوە دێت ئێمە بەبێ قورئان مردوین! ئایا بەوە ڕازی دەبیت کە هاوشێوەی مردووەکان بیت؟ دەی کەواتە بەم قورئانە ناخ و دڵ و دەرونت، ماڵ و منداڵت بژێنەرەوە.

## ملیۆنەها کردەوەی چاکە

چەندە جوانە (لەکاتی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزدا) هەست بە بەخششەکانی خوای گەورە بکەیت بەوەی، کە پاداشتێکی گەورەت دەداتەوە لە بەرانبەر لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزدا، لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ئەم فەرموودە گێردراوەتەوە:

{عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ(ﷺ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): «مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لاَ أَقُولُ (الم) حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلاَمٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ»}[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود(ﷺ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: «هەر کەس پیتێک لە کتێبی خوا (واتە: قورئانی پیرۆز) بخوێنێتەوە چاکەیەکی بۆ هەیە، وە چاکەش یەک بە دەیە، ناشڵێم (الم) هەمووی یەک پیتە، بەڵکو ئەلیف پیتێکە و، لام پیتێکە و، میم پیتێکە».

واتە لەبەرانبەر خوێندنەوەی (الم) دا سی کردەوەی چاکەت بۆ دەنوسرێت، خوای گەورە پاداشتی چەند بەرام بەریش دەداتەوە بە هەرکەسێک کە خۆی بیەوێت.

---

١ ) أَخْرَجَهُ التِّرمذيُّ: ٢٩١٠، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، البَيْهَقي في شعب: ٢٩٩٣٣، انظر: صَحيح الجَامع: ٦٤٦٩.

## ئایا دەزانی قورئان لە چەند پیت پێکهاتوە؟

قورئـان لـە سـێ سـەدو بیسـت هـەزار پیت پێکهاتـوە! لەگـەڵ ئـەم هەمـوو پاداشـتە گەورەیـەدا، کـە پـەروەردگار بـۆ بەندەکانـی ئامـادە کـردوەو، لـە فەرمـوودەی پێغەمبـەری نازداریشـدا (ﷺ) هاتـووە، کـە پاداشـتی خوێندنـەوەی پیتێـک لـە قورئـان دە بـەرام بـەری خۆیەتـی!

واتـە: (لـە پاداشـتی خوێندنـەوەی هەمـوو قورئانـدا) سـێ ملیـۆن و دووسـەد هـەزار کـردەوەی چاکـەت بـۆ دەنوسـرێت!؟ مـن لێـرەدا پرسـیارێک دەکـەم: ئـەو کەسـەی قورئـان لەبـەر دەکات چەنـد جـار لەبـەر خۆیـەوە ئایەتـەکان دووبـارە دەکاتـەوە؟ چەنـد جـار پێداچونەوەیـان دەکاتـەوە؟ چەنـد جـار لـە کاتـی خەڵـوەت و تەنیایـی و هەبوونـی دەرفـەت دا دووبارەیـان دەکاتـەوە؟... کـێ لـە ئێـوە ئـەم پاداشـتە گەورەیـەی ناوێـت؟!




پیرۆزت بێت، کە ئەبێت بەیەکێک لەوانەی (دۆست و هەڵبژێردراوی خوای پەروەردگارن!!)

ئەی ئەو کەسەی نییەتی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزت هێناوە، موژدەت لێ بێت بۆ هەموو چاکەیەک، کاتێک خوای گەورە پێت دەڵێت: ئا ئەوانە دۆست و هەڵبژێردراوی منن، **ئەم پەیامەی پەروەردگار چی بە تۆ دەگەیەنێت!!** بەدڵنیاییەوە زۆر نهێنی لە پشت ئەم پەیامەی خوای گەورەوە خۆیان حەشار داوە و لە گرنگترینیان ئەوەیە، کە پەروەردگار قورئانخوێنەکان لە هەموو خراپەیەک دەپارێزێت و، هەموو شتێکی چاکیان بەبێ بەرانبەر پێ دەبەخشێت، ئەی بۆچونت چۆنە ئەگەر ببیتە دۆست و هەڵبژێردراوی خوای پەروەردگار.

لەگەڵمدا هەست بەواتای ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بکە:

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ(ﷺ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): «إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ هُمْ ؟ قَالَ: «هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ: أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ»}[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک(ﷺ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: «بێگومان خوا کەسانێکی تایبەتی هەن لە نێو خەڵک»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوانە کێن؟ فەرمووی: «ئەوانەی قورئانیان لەبەرەو کاری پێدەکەن، ئەوانە کەسانی تایبەتی خوان».

خوای گەورە بە چ شێوازێک لەگەڵ کەسە تایبەتەکانی خۆیدا مامەڵە دەکات؟ چۆن رزق و رۆزییان دەدات و دەیانپارێزێت؟ چۆن لەدونیا و دوارۆژدا پلە و پایەیان بەرز ناکاتەوە... بەڵی گومانی تێدا نییە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هەمووان هان دەدات بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز.

---

١ ) أَخْرَجَهُ أحمد: ١٢٣٠١، وَإِبْنُ مَاجَهْ: ٢١٥. انظر: صَحِيح الْجَامع: ٢١٦٥، صَحِيح التَّرْغيب وَالتَّرْهيب: ١٤٣٢.

## پلەو پایەی ئەو کەسەی قورئان لەبەر دەکات

لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەهێنین:

[عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ(ﷺ): أَنَّ نَبِيَّ (ﷺ) قَالَ لِأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: «إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أُقْرِئَكَ القُرْآنَ» قَالَ: آللَّهُ سَمَّانِي لَكَ؟ قَالَ: «نَعَمْ» قَالَ: وَقَدْ ذُكِرْتُ عِنْدَ رَبِّ العَالَمِينَ؟ قَالَ: «نَعَمْ» فَذَرَفَتْ عَيْنَاهُ][1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک(ﷺ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرمووو: «إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أُقْرِئَكَ القُرْآنَ»، واتە: بەڕاستی خوا فەرمانی پێکردووم قورئانت بەسەردا بخوێنمەوە، ئوبەی گوتی: ئایا خوا ناوی منی هێنا لە لای تۆ؟ پێغەمبەر (ﷺ) لە وەلامدا فەرمووی: بەڵێ، جا ئیتر ئوبەی (لە خۆشی ئەم هەواڵە) دەستی کرد بە گریان.

قەتادە دەفەرموێ: پێم وترا، کە خوێندرا بەسەریدا ئایەتی: ﴿لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ①﴾ البيّنة: ١[2].

بۆچی ئوبەی خۆی پێ نەگیراو فرمێسک لە چاوەکانی هاتنە خوارەوە؟ لە خۆشی ئەو ڕێزەی کە لەلایەن زاتی خواوە لێی گیراوە، بێگومان ئوبەی بەهۆکاری قورئانی پیرۆزەوە گەیشت بەم پلەو پایە گەورەیە، ئایا تۆ حەز دەکەیت بەم پلەو پایە بگەیت؟

---

١ ) أَخْرَجَهُ البخاري: ٤٩٦١، وَمُسْلم: ٧٩٩.

٢ ) صحيح: ونص الحديث أخرجه البخاري في ((صحيحه))، برقم (٤٩٦٠)، عن أنس بن مالك.

## لەبەرکردنی قورئان دوا مەخە و مەڵێ دواتر دەست پێ دەکەم

ئەی ئەو کەسەی دەتەوێت قورئان لەبەر بکەی، هەر ئێستا بەبێ وەستان و دوودڵی دەست بکە بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، هەرگیز لە کاروان دوا مەکەوە و مەڵێ لە داهاتودا دەست دەدەمە ئەم کارە پیرۆزە، مەترسە بێگومان خوای گەورە قورئانی پیرۆزی ئاسان کردوەو، تەنها پێویستی بە ئیرادە و ویست و هیممەت بەرزی تۆ هەیە، بیهێنە پێش چاوی خۆت کەسێک دەیەوێت خۆی فێری مەلەوانی بکات و بەترسەوە لەبەردەم ئاوەکەدا ڕادەوەستێ، بێگومان نمونەی ئەم جۆرە کەسانە هەرگیز فێری مەلەوانی نابن، تا ئەو ترسە لەخۆیان دانەڕنن.

بەڵام ئەگەر ڕاستەوخۆ و بەبێ ترس بازیدایە ناو ئاوەکەوە، ئەوە بێگومان لەو ساتەوە قۆناغ بە قۆناغ فێری مەلەوانی دەبێت، لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزیش بەهەمان شێوەیە، دەی کەواتە هەر ئێستا و بەبێ وەستان و دوو دڵی دەست بدەرە ئەم کارە پیرۆزە، دڵنیابە بەچاوی خۆت ڕێنمونی خوای پەروەردگار دەبینیت و سەرکەوتوت دەکات و دەتگەیەنێت بەئامانجەکەت.

## شەفاعەتی قورئان لە ڕۆژی دوایی دا

پێویستە هەموان ئەو ڕاستییە بزانین کە قورئانی پیرۆز پارێزەری خاوەنەکەیەتی لە دونیادا و لە ڕۆژی دواییشدا شەفاعەتی بۆ دەکات، هەرکەسێک قورئان لەبەر بکات و بەردەوام دەوری بکاتەوەو، لە ماناو مەبەستەکەی ڕابمێنێت و کاری پێ بکات، پشت بەخوا قورئان لە ڕۆژی دوایی دا دەبێتە شەفاعەتکاری و پشتی تێ ناکات.

سەرنج بدە ئەی مرۆڤ، تۆ بڵێی لە ڕۆژی دوایی دا بارودۆخی مرۆڤەکان بە چ شێوەیەک بێت، لە کاتێکدا تیشکی خۆر زۆر نزیک دەبێتەوە لە دروستکراوەکان، هەموو کەسێک لەو ڕۆژە سەختەدا پێویستی بە شەفاعەتکارێکە تا لە ناڕەحەتییەکان ڕزگاری بکات.

بەڵام ئەو کەسەی قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە لەو ڕۆژەدا بارودۆخی زۆر جیاوازە؟ چونکە دەزانێت شەفاعەتکارێکی هەیە و بەرەو بەهەشتی دەبات کە ئەویش قورئانی پیرۆزەو هاوڕێی بەردەوامی بووە لە دونیادا، ئەو کەسەی لەم بارەوە هەواڵمان پێ دەدات پێغەمبەری ئازیزە(ﷺ)، کە لە هەواو هەوەسی خۆیەوە قسە ناکات و وەک دەفەرموێ:

{«اقْـرَءُوا الْقُـرْآنَ فَإِنَّـهُ يَـأْتِي يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ شَـفِيعًا لِأَصْحَابِـهِ»}[1]، واتە: قورئان بخوێننەوە، بێگومان لە ڕۆژی قیامەت دێت تکاو شەفاعەت بۆ خاوەن و هاوەڵەکانی دەکات.

هەر کەسێک تا ئێستا قورئانی لەبەر نەکردوە... ئەوە پێی دەڵێم: هێشتا درەنگ نەبوە و با لە ئێستاوە دەست پێ بکات.

---

١ ) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٨٠٤، عَنْ أَبُو أُمَامَةَ الْبَاهِلِيُّ.




## لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز:

## جێبەجێ کردنی سوننەتێکی گەورەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)

چەندە جوانە لە کاتی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزدا، بەردەوام ئەو هەستەت لەلا دروست ببێت کە سوننەتێکی گەورەی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) جێبەجێ دەکەیت، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەبەردەوامی هەموو ژیانی لەگەڵ قورئان و لەچوارچێوەی قورئاندا بووە، ئەو خۆشەویستە(ﷺ) هەموو ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ بانگ کردنی خەڵکی بۆ لای قورئان، لە کاتێکیشدا پرسیار لە دایکە عائیشە دەکرێت دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)، لە وەڵامدا دەفەرموێ: {كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ}[1]، واتە: خوڕەوشتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) قورئانی بووە.

---

١ ) أخرجه الطبراني في الأوسط (٠٣/١)، عن عائشة رضي الله عنها، وصححه الألباني في صحيح الجامع، (١١٨٤).

## لەبەرکردنی قورئان

## ڕێنمایی و هیدایەتە، دەتپارێزێت لە گومڕایی

لەسەردەمی خراپە و بیدعە و تاواندا گوێ بگرە لە چارەسەر و ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا(ﷺ)، کە فەرمانی پێمان کردوە دەستی پێوە بگرین، وەک دەفەرموێ: {تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا إِنْ تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللهِ وَسُنَّتِي}[1]، واتە: دوو سەرچاوەم لەدوای خۆم بۆتان بەجێهێشتووە، دەستیان پێوە بگرن هەرگیز گومڕا نابن، ئەوانیش قورئان (کە کتێبی پەروەردگارە) و سوننەتەکانم.

بێگومان ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێداگری و سوربونی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر شوێنکەوتنی قورئان، هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) زانیاری وردی هەبووە دەربارەی ئەوەی لە قورئاندا هەیە لە نمونەی ئایەتەکانی هیدایەت و، هۆکاری دامەزراوی مرۆڤی موسڵمان لەسەر ڕێگای ڕاست، هەرچەندە ڕۆژگار گۆڕانکاری بەسەردا بێت و خراپە و دەردەسەرییەکان زۆرتر ببن.

ئەی ئەو کەسەی قورئانت لەبەر کردووە (ئەی ئەو کەسەی قورئان لەبەر دەکەی) وەهای دابنێ ئێستا لە خزمەت پێغەمبەری ئازیز دایت(ﷺ)، داوای ئامۆژگاری لێ دەکەیت... گوێ بگرەو بزانە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی بەو هاوەڵە ووت، لەکاتێکدا داوای ئامۆژگاری لێی کرد.

{عَنْ أَبِي ذَرٍّ(ﷺ)، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوْصِنِي، قَالَ: «عَلَيْكَ بِتَقْوَى اللَّهِ، فَإِنَّهُ رَأْسُ الأَمْرِ كُلِّهِ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! زِدْنِي، قَالَ: «عَلَيْكَ بِتِلاَوَةِ الْقُرْآنِ، فَإِنَّهُ نُورٌ لَكَ فِي الأَرْضِ، وَذُخْرٌ لَكَ فِي السَّمَاءِ»}[2].

---

١) أخرجه الحاكم: ٣١٩، والدار قطني: ١٤٩، والبيهقي: ٢٠١٢٤، وحسنه الألباني في المشكاة: ١٨٦.
٢) أَخْرَجَهُ إِبْنُ حِبَّان: ٣٦١، انظر: صَحيح التَّرْغيب وَالتَّرْهيب: ٢٢٣٣، ٢٨٦٩.

واتــە: ئەبـو زەڕ(ﷺ) دەڵـێ: گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئامۆژگاریـم بکـە، (پێغەمبـەر(ﷺ)) فەرمـووی: «پاریـز بکـە (لـە سـنوورەکانی) خـوا، ئـا ئـەوە چڵەپۆپـەو گـەورەی هەمـوو کارە باشـەکانە»، گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! بـۆم زیـاد بکـە (زیاتـرم پێبڵـێ)، فەرمـووی: «قورئـان بخوێنـەوە، چونکـە نـوورە بـۆت لـە زەویـداو، توێشـووە بـۆت لـە ئاسـماندا».

## ئەو کەسەی قورئانی لەبەرە پێش دەخرێت بەسەر هەمواندا

لە کاتی پێشنوێژی کردندا، ئەو کەسەی زۆرترین قورئانی لەبەرە پێش دەخرێت بەسەر ئەوانی تردا، لەم بارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دێنین:

{عَـنْ أَبِي مَسْـعُودٍ الأَنْصَـارِيِّ(ﷺ)، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللّـهِ(ﷺ): «يَـؤُمُّ الْقَـوْمَ أَقْرَؤُهُـمْ لِكِتَـابِ اللّـهِ، فَـإِنْ كَانُـوا فِي الْقِـرَاءَةِ سَـوَاءً، فَأَقْدَمُهُـمْ بِالسُّـنَّةِ، فَـإِنْ كَانُـوا فِي السُّـنَّةِ سَـوَاءً فَأَقْدَمُهُـمْ هِجْـرَةً، فَـإِنْ كَانُـوا فِي الْهِجْـرَةِ سَـوَاءً، فَأَقْدَمُهُـمْ سِـلْمًا، وَلاَ يَؤُمَّـنَّ الرَّجُـلُ فِي سُـلْطَانِهِ، وَلاَ يَقْعُـدْ فِي بَيْتِـهِ، عَـلَى تَكْرِمَتِـهِ إِلاَّ أَنْ يَـأْذَنَ لَـكَ»}[1].

واتە: ئەبو مەسعوودی ئەنصاریی(ﷺ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: «با شارەزاترین کەس بە کتێبی خوا پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات، ئەگەر (خەڵکەکە) لە خوێندنی و (شارەزایی) بە قورئاندا وەک یەکتری بوون، ئەو کەسەیان پێش دەخرێ کە شارەزاترینیانە بە سوننەت، جا ئەگەر لە (شارەزایی) لە سوننەتیشدا وەک یەک بوون، ئەو کەسەیان پێش دەخرێ کە زووتر کۆچ (هِجْرَة)ی کردوە، جا ئەگەر لە کۆچکردنیشدا وەکو یەکتر بوون، ئەو کەسەیان پێش دەخرێ کە زووتر مسوڵمان بووە، وە با هیچ کەس پێش کەسێکی دیکە نەکەوێ و ئیمامەتی بۆ نەکات لە شوێنی

١ ) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٧١٠٤، ومُسْلِم: ٦٧٣، وَأَبُو دَاوُدَ: ٥٨٢، وَالتِّرمِذي: ٢٣٥.

دەسـەڵات و فەرمانڕەوایەتیەکەی (وەک: ماڵ و فەرمانگە و مزگەوت و... هتد)، وە لەسـەر شـوێنی دانیشـتنی تایبەتی خۆیشـی دامەنیشـە لە ماڵەکەیدا، تەنها بـە مۆڵەتـی ئـەو نەبێت».

بەهەمان شـێوە لە کاتی بەخاکسپاردنی چەند مردوویەکدا، ئەو کەسـەی قورئانی لەبەربوە لە بەخاکسپاردندا بەسەر ئەوانی تردا پێش دەخرێت، لەم بارەوە جابری کوڕی عبدالله دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەهیدەکانی ئوحودی دوو دوو دەخستە ناو پۆشاکێکەوە و پاشان دەیفەرموو: کامەیان زۆرترین قورئانـی لەبـەرە؟ ئەگـەر ئاماژەیـان بۆ یەکێکیـان بکردایـە ئـەوە لە بەخـاک سـپاردندا پێشـی دەخسـت و دەیفەرمـوو: مـن لـە ڕۆژی دوایـی دا شـاهیدم بەسـەر ئەمانـەوە و پاشـان فەرمانـی دەکرد بەخوێنەکەیانـەوە و بەبێ شـۆردن و نوێژ لەسـەر کردن بەخاک دەسـپێردران.

تەنانـەت لـە کاروبـاری دونیاشـدا ئـەو کەسـەی قورئانـی لەبـەرە، پێش دەخرێت بەسـەر کەسـێکی تـردا ئەگـەر لـە تواناکانیانـدا یەکسـان بـوون.

هەروەهـا ئـەم قورئانـە بەرزکـەرەوە و نـزم کـەرەوەی پلـە و پایـەی مرۆڤەکانـە، هـەروەک پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە فەرموودەیەکدا دەفەرمـوێ: {«إِنَّ اللَّـهَ يَرْفَـعُ بِهَـذَا الْكِتَـابِ أَقْوَامًـا، وَيَضَـعُ بِهِ آخَرِيـنَ»}[1] واتـە: «بـە دڵنیایی خوا کۆمەڵێک بـەرز دەکاتـەوە بـە هـۆی ئـەم کتێبـە (واتـە: قورئـان)، وە هەندێکی دیکەشـی پێ نـزم دەکاتـەوە».

**ئایا تا ئێستا دوو دڵی لە بڕیاردان بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز**

١ ) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٣٢، وَمُسْلِم: ٨١٧.

## لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز قەڵغان و شیفایە

زۆرێک لە ئێمە لە کاتێکدا نەخۆش دەکەوین، داوا لە کەسێکی قورئان لەسنگ دەکەین بۆ ئەوەی ڕوقییەی شەرعیمان بەسەردا بخوێنێت؟ چونکە خوای گەورە بۆمانی ڕوون کردوەتەوە، کە ئەم قورئانە شیفایە، وەک دەفەرموێ: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾ الإسرَاء: ٨٢. واتە: لەم قورئانەدا دەنێرینە خوارەوە ئەوەی، کە هۆی شیفا و میهرەبانییە بۆ بڕواداران، بەڵام {هاتنی ئەم قورئانە} بۆ ستەمکاران هیچ زیاد ناکات جگە لە خەسارەت مەندی نەبێت. هەروەها دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ﴾ فُصِّلَت: ٤٤. واتە: {ئەی ﷺ} بڵێ: قورئان بۆ کەسانێک کە باوەڕیان پێی هێناوە ڕێنیشاندەر و شیفایە.

ئەوەی بەڵێنی داوە قورئان شیفایە خوای گەورەیە: ﴿..وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا﴾ النِّسَاء: ٨٧. واتە: جا کێ لە خوا قسە و {بەڵێنی} ڕاستترە. لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿..وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾ النِّسَاء: ١٢٢. واتە: ئایا کێ لە خوای گەورە ڕاست بێژترە.

ئەگەر دووچاری هەر جۆرە نەخۆشییەک بوویت، پێویستە باوەڕی تەواوەتیت بەوە هەبێت کە قورئان شیفات دەدات، هەر لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ڕوقیەی شەرعیمان فێر دەکات.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕوقیەی شەرعی بۆ حەسەن و حوسەین ئەنجامدا، هەروەها فێرمان دەکات کە ڕوقیە بۆ خۆمان بکەین و جیاوازی نییە ئەگەر بەخوێندنی سورەتی (الفاتحة) بێت، یان خوێندنی (آية الكرسي)، یاخود کۆتاییەکانی سورەتی (البقرة)[1] و، ئایەتەکانی تری قورئانی پیرۆز.

---

١) لە ئەبو مەسعودەوە هاتوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: [مَنْ قَرأَ بالآيَتينْ

پرسیار: ئێستا هەستت چۆنە ئەو کەسەی ڕوقیەی خۆی دەکات، هەر ئەو کەسە بێت، کە لە سنگیدا قورئانی پیرۆز هەیە؟ بیربکەوە ئەگەر تۆ قورئانت لەبەر بێت: داخۆم بە چ شێوازێک خوای گەورە هەموو جۆرە نەخۆشی و خراپەیەکت لێ دوور بخاتەوە؟

ئایا ئێستا کاتی ئەوە نیە قورئانی پیرۆز لەبەر بکەیت؟.

## بۆ ئەو کەسەی گومانی هەیە و دوو دڵە دەربارەی ئەوەی کە پەروەردگار قورئانی ئاسان نەکردبێت بۆ لەبەرکردن

لە زۆرێک لە گەشتە قورئانییەکانم دا بەخزمەت خەڵکانێک گەیشتوم.. منداڵانێک کە تەمەنیان لە دە ساڵ تێپەڕی نەدەکرد.. هەموو قورئانی پیرۆزیان لەبەر کردبوو سەرباری بچوکی تەمەنیان.. بەخزمەت کەسانێکی نەخوێندەوار گەیشتوم، کە توانای خوێندنەوە و نوسینیان نەبوو.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو قورئانیان لەبەر کردبوو.. لەگەڵ کەسێکی نابینادا دانیشتم کە چاوەکانی هیچیان نەدەبینی.. بەڵام لەڕێگەی گوێگرتنەوە هەموو قورئانی لەبەر کردبوو، **بەخزمەتی برایەک گەیشتم، مێشک و ژیری دوچاری نەخۆشییەکی ئەوتۆ هاتبوو کە هیچ شتێکی دەربارەی ژیان نەدەزانی.. لەگەڵ ئەوەشدا** خوێندنەوەکەی بەشێوەیەک بوو، هیچ هەڵەیەکی تیادا نەدەکرد، چەندین ڕۆژ لەگەڵ کەسانێکدا بووم، کە بەجوانترین شێوە هەموو قورئانیان لەبەر کرد بوو، وە شارەزاییەکی تەواویان دەربارەی قورئانی پیرۆز هەبوو.. لەگەڵ ئەوەی ئەمانە بەزمانی عەرەبی قسە ناکەن! بێگومان قورئانی پیرۆز موعجیزەیەکی خواییە، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ⑨﴾ الحجر: ٩.

---

مَنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ﴾ أخرجه البخاري في ((صحيحه))، برقم (٥٠٤٠)، ومسلم في (صحيحه)، برقم (٨٠٨). واتە: هەرکەسێک ئەو دوو ئایەتەی کۆتایی سورەتی بەقەرە لە شەوێکدا بخوێنێت بەسیەتی.

واتـە: بـێ گومـان هـەر ئێمـە قورئانمـان ناردووەتـە خـوارەوە و بەڕاسـتی هـەر ئێمـەش دەیپارێزیـن.

قورئانی پیرۆز لەناو سنگی مرۆڤەکاندا پارێزراو و تۆمار کراوە، پێش ئـەوەی لەدووتوێی کتێبەکاندا تۆمـار بکرێت.

ئایا دەتەوێت سنگت پڕ بکەی لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز؟.




## قورئانی پیرۆز بۆ هەموو تەمەنەکانە.. بۆ هەموو زمان و.. هەموو مرۆڤایەتییە

کاتێـک بـاس لـە فـەزڵ و گرنگـی لەبەرکردنـی قورئانـی پیـرۆز دەکەین، هەندێک گومانیان وەهایە کە ئەم پەیامە تەنها ئاڕاستەکراوە بۆ منداڵان و لاوان! نەخێر بەپێچەوانـەوە، بەڵکو ئـەم پەیامـە هەمـوو موسـڵمانان دەگرێتـەوە، بـۆ هەمـوو تەمەنەکانـە، ژنـان و پیاوانیـش دەگرێتـەوە، لـە کاتێکـدا ئـەم هـاوکاری و هاندانـە لەئێمـەوە دەبینـی، هەروەهـا شـیکردنەوەی ڕێـگا و یاسـاکانی کـە هاوکاریـت دەکـەن لەسـەر لەبەرکردنـی قورئانـی پیـرۆز، ئـەم زانسـتە تەنهـا پەیوەسـت مەکـە بـە کـور و کچەکانتـەوە و خـۆت واز لـە قورئـان بهێنیت، بەڵکو

تۆش لەگەڵ ئەواندا لەبەری بکە، ئەو ڕێنماییانە جێبەجێ بکە، کە ئاڕاستەی ئەوان دەکرێت، هەرگیز مەڵێ من چوومەتە تەمەنەوە، چل، پەنجا، شەست ساڵی تەمەنم بەڕێ کردوەو پیر بووم، بۆ من شتێکی ئەستەمە، کە لەم تەمەنەدا قورئان لەبەر بکەم!

بەڵێ ڕاستە قورئان لەبەرکردن لەو تەمەنەدا کارێکی قورسە، بەڵام شتێکی ئەستەم نیە.. لە کاتێکدا خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ۝٢٢﴾ القَمَـر: ٢٢. واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئاسان کردوە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن، جا ئایا کەسێک هەیە پەندی لێ وەربگرێت؟ نەیفەرمووە: ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ منداڵان و ئەوانەی تەمەنیان کەمە، بەڵکو قورئان ئاسانکراوە بۆ هەموو تەمەنەکان بەشێوەیەکی گشتی.

کەواتە هەر ئێستا نییەت بهێنە و بڕیار بدە.. قەڵەم و دەفتەر ئامادە بکە و لەگەڵمدا پلانی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بنوسەرەوە، کە لە لاپەڕەکانی دواتردا باسی پلانەکەم کردووە.



لەم بەشەدا باسی ئەو دە بنەمایە دەکەین، پێویستە ئەو کەسانە جێبەجێیان بکەن کە قورئان لەبەر دەکەن؟ چونکە ئەم بنەمایانە ئاسانکار و یارمەتیدەرن بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز..

برای خۆشەویستم لە گەشتی لەبەرکردنی قورئاندا چەندین کۆسپ و نارەحەتیت ڕووبەڕوو دەبنەوە، بەڵێ ئەمە ڕاستییە و پێویستە ئاگاداری بیت؟ چونکە تۆ لەبەردەم گەنجینەیەکی گەورە و بەنرخدایت، دوژمنەکەیشت {شەیتان} لەبەردەم گەنجینەکەدا وەستاوە و بەئاسانی وازت لێ ناهێنێت و ئامانجی ئەوەیە هیچ لەو گەنجینە بۆ خۆت نەبەی، بەلام پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: تۆ بە چ شێوازێک خۆت بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو ئاستەنگ و نارەحەتی و هەڕەشانە ئامادە دەکەیت؟ لێرەدا ئەو کەسانە دەناسرێنەوە، کە ڕاستگۆ بوون لەگەڵ ئامانجەکەیانداو جیا دەکرێنەوە لە کەسانی تر.

لێرەوە چەندین ئاستەنگ و نارەحەتی ڕووبەڕووی ئەو کەسانە دەبنەوە کە قورئان لەبەر دەکەن، ئاستەنگەکانیش نائومێد کەرن و بەهۆیەوە زۆرجار مرۆڤ بڕیار دەدات لە لەبەرکردن بەردەوام نەبێت، وەک ڕۆژانە لە دەوروبەری خۆمان دەیبینین و هەستی پێ دەکەین، دەست دەکات بە لەبەرکردنی جوزئێک یان دوو جوزء، دواتر چەند کێشەیەک ڕووبەڕووی دەبنەوە: ئیتر واز لەم گەوهەرە پیرۆزە دەهێنێت و دەڵێت: من نامەوێ قورئان لەبەر بکەم.

ڕاست دەکەیت شەیتان تۆی گەیاند بەم بڕیار و دەرئەنجامە، هەروەک وتراوە: ئەو کەسەی هەنگوینی دەوێت، پێویستە چاوەڕێی پێوەدانی هەنگ بکات، بەهەمان شێوە کاتێک بڕیار دەدەیت قورئان لەبەر بکەیت، دەبێت خۆت بۆ چەندین ئاستەنگ و نارەحەتی ئامادە

بکەیت، چەندین کەسم بینیوە، کە خاوەن پێداویستی تایبەتی بوون و لەگەشتی لەبەرکردنی قورئاندا ڕووبەڕووی ئاستەنگ و نارەحەتی زۆر بونەتەوە و بەڵام ئەوان چاک لە گەورەیی ئەو بەخششە گەیشتون و کۆڵیان نەداوەو، تا کۆتایی گەشتەکە بەردەوام بوون لە لەبەرکردنی قورئان و سەرئەنجام خوای پەروەردگار ئەو بەخششە گەورەیەی پێیان بەخشیوە.

ئایا حەز ناکەی لەم گەشتەتدا خوای گەورە هاوسەفەرت بێت!! دەی کەواتە بە هەموو تواناتەوە هەوڵ بدەو سارد مەبەرەوە، دڵنیابەو باوەڕی تەواوەتیت بەوە هەبێت پەروەردگار هەموو کاروبارەکانت بۆ ئاسان دەکات؟ چونکە تۆ لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە دەتەوێت هەموو قورئان لەبەر بکەیت، هەر خۆیشی دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ۝٦٩﴾ العَنكَبُوت: ٦٩. واتە: کەسانێک کە لەپێناو ڕەزامەندی ئێمەدا تێکۆشانیان کردووە بەڕاستی ڕێنموونییان دەکەین بۆ ڕێگا چاکەکانی خۆمان، بێگومان خوا لەگەڵ چاکەکاراندایە. کەواتە وریابە! هەرگیز نائومێدی ڕووت تێ نەکات و ڕێگاکەت تەواو بکە.



ئەو کەسەی هەنگوینی دەوێت،
پێویستە چاوەڕێی پێوەدانی هەنگ بکات

## ١ بنەمای یەكەم: دڵسۆزی (ئیخلاس) ڕێگای سەرەتایە

لە كاتێكدا تۆ خۆت یەكلا كردووەتەوە بۆ لەبەركردنی قورئانی پیرۆز، ئەمە ئاماژەیە و پێمان دەڵێت: خوای گەورە تۆی هەڵبژاردووە بۆ ئەو كارە پیرۆزە، یەكەمین پلانی سەر ڕێگاكەت بریتییە لە دڵسۆزی (ئیخلاس)، بێگومان هەموو كار و كردەوەیەكی چاك پێویستی بە دڵسۆزی (ئیخلاس) هەیە، ئەی ئەگەر ئەو كارو كردەوە چاكە لەبەركردنی قورئانی پیرۆز بێت، كە هەموو بەیانیان و ئێوارانێك لەناو دڵان و لەسەر زاراندایە.

كەواتە: دڵت خاوێن بكەرەوەو نییەتت یەكلا بكەوە بۆ خوای گەورەو، وازبهێنە لە هەموو كاروبارێكی لاوەكی، كە باڵی كێشاوە بەسەر دەروونتدا و ڕێگرە لەبەرانبەر یەكلابونەوەت بۆ خوای گەورە، ئەو كاتە موژدەی هەموو خێر و چاكە و دەلاقە كرانەوەیەكت لێ بێت لەو گەشتەتدا، كە خوای گەورە پێتی دەبەخشێت.

لەو نهێنی یانەش، كە بەدرێژایی گەشتەكەت یارمەتیت دەدەن و ئیخلاست بیر دەخەنەوە ئەوەیە؛ كە (نییەتت نوێ بكەیتەوە) ئەمەش كارێكی گرنگە، زۆرێك نازانن مەبەست چییە لەوەی كە دەوترێ (نییەتت نوێ بكەرەوە)؟ ئایا زیاتر لە یەك نییەت بوونی هەیە لە گەشتی لەبەركردنی قورئاندا؟!

بەڵێ لەگەشتی لەبەرکردنی قورئاندا زیاتر لە (نییەتێک) بوونی هەیەو، بەڵام ئامانج لەم هەموو نییەتانە تەنها بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەیە... پرسیار لە خۆت بکەو بڵێ: بۆچی قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەم؟!

هەندێک لە خەڵکی کاتێک قورئان لەبەر دەکەن تەنها ئامانجیان نزیکبونەوەیانە لە قورئانی پیرۆز، ئەم ئامانجەش وەهایان لێ دەکات لە هەموو شوێنێکداو لەناو ماڵ و لە مزگەوت و لەکاتی کار کردن و لەناو ئۆتۆمبێلدا بەردەوام دەوری قورئان بکەنەوە بە خوێندنەوە و گوێگرتن لێی، ئیدی بەم هۆکارەوە هەموو ساتەکانی ژیانیان پڕن لە کارو کردەوەی جوان، بەڕاستی ئەمەش نییەتێکی زۆر جوانە، هەندێکی تر دەیانەوێت بەم هۆیەوە ببنە دۆست و هەڵبژێردراوی خوای گەورە، هەندێکی تریش دەیانەوێت لە ڕێگای لەبەرکردنی قورئانەوە زیاتر لە پەیامەکەی خوا شارەزا ببن، لەپێناو فێرکردنی کەسانی ترو بەدەستهێنانی کار و کردەوەی چاکە، ئاواتیان ئەوەیە بکەونە بەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ): {عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ(ﷺ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) قَالَ: «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ»}[1]، واتە: عوسمانی کوڕی عەففان(ﷺ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: «باشترینتان ئەو کەسەیە، فێری قورئان دەبێ و، خەڵکیش فێر دەکات».

هەندێکیش دەیانەوێت بەم هۆکارەوە بگەنە پلە بەرزەکانی بەهەشت، وەک لەم فەرموودە هاتوە: {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو(ﷺ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): «يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ: اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ، كَمَا

١ ) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٤٧٣٩.

كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا}[1]. واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر(ﷺ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: «بە هاوەڵی قورئان (واتە: ئەو کەسەی قورئانی خوێندوە، یان دەرخی کردوە) کە دەچێتە بەهەشت، دەگوترێ: بخوێنەرەوەو بەرز بەوەو سەربکەوە، هەروەک لە دونیادا دەتخوێندەوە، بێگومان شوێنی تۆ لە لای دوا ئایەتە کە دەیخوێنیتەوە».

ئەبو هورەیرە(ﷺ)، دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: [«يَجِيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! حَلِّهِ فَيُلْبَسُ تَاجَ الْكَرَامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! زِدْهُ، فَيُلْبَسُ حُلَّةَ الْكَرَامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! ارْضَ عَنْهُ، فَيَرْضَى عَنْهُ، فَيُقَالُ لَهُ: اقْرَأْ وَارْقَ وَيُزَادُ بِكُلِّ آيَةٍ حَسَنَةً»[2]، واتە: «لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان دێ (لەگەڵ ئەو کەسەی خوێندوویەتی لە دونیا) دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم! بیرازێنەوەو خشڵی لەبەر بکە، جا تاجی ڕێزی لەسەر دەنرێ، پاشان دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم زیاتری پێبدە، جا پۆشاکی ڕێزی لەبەر دەکرێ و دەرازێنرێتەوە، ئینجا قورئان دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم لێی ڕازیبە، خواش لێی ڕازی دەبێ، ئینجا بەو کەسە دەگوترێ: قورئان بخوێنەو سەربکەوە (بۆ پلەکانی بەهەشت) وە بە هەر ئایەتێک چاکەیەکی بۆ زیاد دەکرێ».

---

١ ) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ١٤٦٦، والتِّرمِذِيُّ: ٢٩١٤، وَابْنُ مَاجَه: ٣٧٨٠، وَقَالَ التِّرمِذِيُّ: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

٢ ) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ: ٢٩١٥، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، والحاكم: ٢٠٢٩، انظر: صَحِيح الْجَامِع: ٨٠٣٠.




نوێکردنەوەی نیيەت گرنگییەکی یەکجار زۆری هەیە؛ چونکە لە گەشتەکەتدا لەگەڵ قورئان دوچاری لاوازی و ساردبونەوە دەبیت، گومان لەوەدا نیە کە نوێکردنەوەی نیيەت ئەم هەستە خراپانەت لێ دوور دەخاتەوە، کەواتە پێش دەست کردنت بەلەبەرکردنی قورئان، ئامانج و نیيەتت دیاری بکە، ئەو فەرمایشتە چاپ بکە کە هانت دەدات بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، لە شوێنێکی گرنگدا هەڵیواسە با بەردەوام لەبەرچاوت بێت وەک پێشەواو ڕێنیشاندەرێک.

## ٢ بنەمای دووەم: تەوبەو وازهێنان لە تاوان

تۆ دەتەوێت لە دۆستانی خوای گەورە بیت و لە هەمان کاتدا بەتاوان و سەرپێچی خوای پەروەردگار لە خۆت توورە بکەیت؟! چۆن و بە چ شێوازێک چاوەڕێی هاوکاری و یارمەتی خوایی دەکەیت لە کاتێکدا سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەیت؟!

لە گرنگترین ئەو بنەمایانەی کە پێویستە لەکاتی لەبەرکردنی قورئاندا ڕەچاویان بکەیت: وازهێنانە لە تاوان و سەرپێچی، دەزانم هەمومان خاوەن گوناهو تاوانین، بەڵام لە گەشتی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزدا پێویستە زۆر پێداگربیت لەسەر دورکەوتنەوە لە تاوان و سەرپێچی، پێویستە زۆر هۆگربوونت بە تەوبە و ئیستغفارەوە خاڵی جیاکەرەوەت بێت لە موسڵمانان بەشێوەیەکی گشتی.

هەروەها کۆمەڵە ئەندامێکی جەستەت هەن کە لە لەکاتی لەبەرکردنی قورئاندا بەکاریان دەهێنیت، ئەوانیش بریتین لە: چاو، گوێ، زمان، ئەمانە؛ ئەو ئەندامانەی جەستەتن، کە بۆ لەبەرکردنی چاکترین و پیرۆزترین وتە بەکاریان دەهێنیت، کە فەرمایشتی خوای گەورەیە.. تۆ چۆن بەو چاوانەت لەلایەک سەرپێچی خوا دەکەیت و هەمانکات قورئانیان پێ دەخوێنیتەوە؟! چۆن گوێ بۆ گۆرانی و غەیبەت دەگریت و هەر بەو گوێچکانەت گوێ بۆ قورئانیش دەگریت، هەروەک ئیبن قەیم دەفەرموێ:

حب الكتاب وحب ألحان الغنا     في قلب عبد ليس يجتمعان

واتـە: خۆشەویسـتی قورئـان و خۆشەویسـتی گۆرانـی لـە دڵێک دا کۆ نابنـەوە.

هەروەهـا زمانـت بپارێـزەو غەیبەتـی خەڵکـی پـێ مەکـەو هەوڵـی لەکەدارکردنـی کەسـایەتییان مـەدە؟ چونکـە تـۆ بـەم زمانـەت قورئـان دەخوێنیتـەوە، بێگومـان تـاوان کاریگـەری لەسـەر دڵیشـت بەجـێ دەهێڵێت و توانـای لەبـەر کردنیشـت لاواز دەکات، دواجـار تاوانـەکان لـەو کارە پیرۆزە ساردت دەکەنـەوە، لەبەرئـەوە کاتێک ئیمامـی مالیک زیرەکـی و بیرتیـژی ئیمامـی شـافیعی بینـی پێـی فەرمـوو: ((لقـد ألقـى اللـه «سـبحانه وتعـالى» عـلى قلبـك نـورا فـلا تطفئـه بظلمـة المعصيـة)).

واتـە: خـوای گـەورە نـورو ڕۆشـنایی لـە دڵتدا چاندووە، بـە تاریکی گونـاە ئـەو نـورە مەکوژێنـەوە.






## ٣ بنەمای سێیەم: دیاریکردنی کات

لەسەرت پێویستە بۆ ئەم کارە پیرۆزەت کاتێکی گرنگ دیاری بکەیت، ئەمەش لە گرنگترین بنەماکانی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزن، ئەگەر تۆ پەرۆشی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزیت... ئەوا بەهیچ شێوەیەک مەڵێ کاتم نیە؟ چونکە قورئان پەڕاوێکی خۆشەویستە و کاتی بێ سود و لاوەکی بۆ تەرخان مەکە، لەبەرکردنی مەکەرە شتێکی لاوەکی و ... هەرگیز مەڵێ: {کەی کاروبارەکانی دونیام کۆتاییان هات، ئەوا پاشماوەی کاتەکەم تەرخان دەکەم بۆ لەبەرکردنی قورئان}!! ئەمە گەورەترین هەڵەیە کە زۆربەی قوتابیانی قورئانی تێکەوتووە.

هەرکەس بەئومێدی پاداشتێکی گەورەوە بەتەمای لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزە، ئەوە لەسەری پێویستە گرنگترین کاتی خۆی بۆ تەرخان بکات و، بارودۆخ و ژینگەی دەوروبەری بەهەر شێوازێک بێت، نابێت دەسبەرداری ئەو کاتە بێت کە دایناوە بۆ لەبەرکردنی قورئان.

## ٤ بنەمای چوارەم: خۆت لە کۆڕ و کۆبونەوەی نەگونجاو بپارێزە

لە کاتێکدا تۆ سەرقاڵی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزیت، پێویستە لەو کەسانە دوور بکەویتەوە کە کاریگەری خراپیان هەیە بەئاراستەی سارد کردنەوەت لەو بەندایەتییە گەورەیە، لەوانەیە ئەو کەسە پیاوچاک و خۆشەویست بێت، بەڵام قسەکانی نەشیاون و بەو هۆیەوە دەبێتە کۆسپێک و دوچاری ساردبونەوەت دەکەن و لە گەشتی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز دادەبڕن.

بەنمونەیەک ئەمە ڕوون دەکەمەوە: لەوانەیە لەشوێنی کارەکەتدا لەگەڵ کەسێکی نەگونجاو دابنیشیت و هەواڵی بدەیتێ بەوەی دەتەوێ قورئان لەبەر بکەیت، ئەویش لەوەڵامدا پێت دەڵێت: ئایا تۆ بەڕاستی بەتەمای لەبەرکردنی قورئانیت؟ چۆن و بە چ شێوازێک کاتی بۆ تەرخان دەکەیت؟ تۆ تەمەنت چووەتە سەرەوە و توانای قورئان لەبەرکردنت نییە؟ قورئان لە (٦٠٠) لاپەڕە پێکهاتوە! چۆن دەتوانی لەبەری بکەیت لە کاتێکدا ئەم هەموو کاروبارانەت هەیە؟

لاحول ولا قوة إلا بالله.. چەندە قوتابی قورئان دەناسم، کە بەهۆکاری کاریگەربوونیان بەم جۆرە وشە ڕوخێنەرانە گەشتونەتە ئەو باوەڕەی، کە پرۆژەکە قورسە و دواجار دەستیان هەڵگرتوە لە لەبەرکردنی قورئان!! من دڵنیام تۆ لەو جۆرە کەسانە نیت، بەڵام خۆت تاقی مەکەرەوە و گوێ لەو جۆرە وشە نەشیاوانە مەگرە، خۆت لەو کۆڕ و کۆبونەوانە بەدوور بگرەو، جگە لە سڵاو کردن لێیان لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا زۆر گفتوگۆ مەکە.

## وتەیەک بۆ ئەو کەسانەی کە سارد و سڕن

ئەگەر تۆ ناتەوێ قورئان لەبەر بکەیت، ئەوە لەوە دڵنیابە خوای پەروەردگار تۆی بۆ ئەم کارە پیرۆزە هەڵنەبژاردووە و بەڵام کەسانی تریش سارد مەکەرەوە، بێگومان زۆر کەس هەن دەیانەوێت قورئان لەبەر بکەن، لەوانەیە وشەیەکی تۆ نائومێدی لە دڵیاندا بچێنێت، کەواتە با قسەت جوان و هیوابەخش بێت، وەک پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:

{الكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ}[1]، واتە: ووتەی چاک خێر و سەدەقەیە. ئەگەر قسەی چاک و هیوابەخش و بنیاتنەریش ناکەیت... ئەوە باشترین شت بێدەنگ بوونتە.



١ ) أَخْرَجَهُ البُخَاري: ٢٩٨٩، ومسلم: ١٠٠٩، عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

۵ **بنەمای پێنجەم:**

## بیهێنەرە پێش چاوی خۆت کە ئامانجەکەت پێکاوە

بیهێنەرە پێش چاوی خۆت
هەموو قورئانی پیرۆزت لەبەرکردووە

«الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ»
واتە: «کەسی کارامە (لە خوێندن و کارپێکردنی) قورئاندا، لەگەڵ فریشتە ڕێزدارە بەڕێزەکانی خوایە، وە ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێ و لەسەر زمانی تەواو نایێ (واتە: چاك نایزانێ) وە لەسەریشی قورسە، دوو پاداشتی بۆ هەیە».

«يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ: اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ، كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا»
واتە: ئەو کەسەی قورئانی خوێندوە، یان دەرخی کردوە) کە دەچێتە بەهەشت، دەگوترێ: بخوێنەرەوەو بەرز بەوەو سەربکەوە، هەروەك لە دونیادا دەتخوێندەوە، بێگومان شوێنی تۆ لە لای دوا ئایەتە کە دەیخوێنیتەوە».

«اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لأَصْحَابِهِ»
واتە: قورئان بخوێننەوە، بێگومان لە ڕۆژی قیامەت دێت تکاو شەفاعەت بۆ خاوەن و هاوەڵەکانی دەکات.

بیهێنەرە پێش چاوی خۆت کە هەموو قورئانی پیرۆزت لەبەرکردوە: [عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): «الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ

عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ»[1]، واتە: عائیشە(ﷺ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: «کەسی کارامە (لە خوێندن و کارپێکردنی) قورئاندا، لەگەڵ فریشتە ڕێزدارە بەڕێزەکانی خوایە، وە ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێ و لەسەر زمانی تەواو نایێ (واتە: چاک نایزانێ) وە لەسەریشی قورسە، دوو پاداشتی بۆ هەیە».

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: [يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرآنِ: اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ، كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا][2]، واتە: «بە هاوەڵی قورئان (واتە: ئەو کەسەی قورئانی خوێندوە، یان دەرخی کردوە) کە دەچێتە بەهەشت، دەگوترێ: بخوێنەرەوەو بەرز بەوەو سەربکەوە، هەروەک لە دونیادا دەتخوێندەوە، بێگومان شوێنی تۆ لە لای دوا ئایەتە کە دەیخوێنیتەوە».

بەڵێ بیهێنەرە پێش چاوی خۆت، کە ئێستا لە کۆتا ساتەکانی لەبەرکردنەکەت دایت، چاوەکانت دابخە و وەهای دابنێ، کە کۆتاییەکانی سورەتی (البَقَرَة) بە دەرخ بۆ مامۆستاکەت دەخوێنیتەوە، ئەم چرکە ساتانە بهێنەرە پێش چاوانت، کە لە خۆشیدا و بەگریانەوە سوجدەی سوپاسگوزاری بۆ خوای پەروەردگار دەبەی، ئای چ دیمەنێکی جوان و کاریگەرە.

هەرگێز نەڵێی: هێشتا لەسەرەتای کارەکەدام و بەشێکی زۆری قورئانی پیرۆزم ماوە کە لەبەری بکەم، بەڵکو بە ئومێدەوە بڵێ: ئەو پەروەردگارەی منی بۆ ئەم کارە پیرۆزە دیاری کردو هەڵی بژاردم، هەر بە یارمەتی خۆیشی هەموو قورئان لەبەردەکەم، من کاتێک لە لەبەرکردنی سێ جوزء بومەوە، باوکم پێی گوتم: کوڕی

---

١ ) أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٤٦٥٣، وَمُسْلِم: ١٨٩٨.

٢ ) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ١٤٦٦، والتِّرمِذِيُّ: ٢٩١٤، وَابْنُ مَاجَه: ٣٧٨٠، وَقَالَ التِّرمِذِيُّ: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

شیرینم «فەهد» وەهای دابنێ لە ئێستاوە ئامانجەکەت پێکاوە، لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ڕاستگۆبە «لەوە دڵنیابە سەرکەوتوت دەکات»، بێگومان ئەم وشانە وزەیەکی گەورە بوون و زیاتر بونە هاندەرم، تا لەسەر بڕیارەکەم پێداگربم و هیممەتیان بەرزتر کردمەوە.

بەردەوام ئەو ئایەت و فەرمودانە دووبارە بکەرەوە، کە باسی گەورەیی پلەو پایەی خوێندنەوەی قورئان و لەبەرکردنی دەکەن، بێگومان ئەمەش وزەت پێدەبەخشێت و «هیممەتت «بەرز دەکاتەوە.

## ٦ بنەمای شەشەم:
## کەسانی تر لە ئامانجەکەتدا بەشداری پێ بکە

چەند جوانە کاتێک لە گەشتی لەبەرکردنی قورئاندایت و یەک لە خۆشەویستانت دیاری دەکەیت، تا بەشدار بێت لە پێکانی ئامانجەکەتدا، بێگومان مەبەستم ئەوە نیە، کە لەگەڵ تۆدا قورئان لەبەر بکات، چونکە لەوانەیە یەکێکیان بڵێت: ناتوانم قورئان لەبەر بکەم، دەکرێت ئەو کەسەی دیاری دەکەیت باوکت یان دایکت یان هاوڕێیەکت بێت، یاخود دیاری کردنی یەکێک لەو کەسانەی، کە لە شوێنی کارەکەتدا بەیەکەوەن.

مەبەست لە بەشداری پێ کردن ئەوەیە: داوایان لێ بکەی هاوکاریت بکەن لە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزداو، پێیان بڵێ: کاتێک بینیتان وازم لێ هێناوە، ئەوە ئامۆژگاریم بکەن و ئاڕاستەم بکەن، تا دوبارە دەست دەکەمەوە بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، بێگومان ئەم جۆرە بەشداری پێ کردنانە لەو هۆکارانەن کە یارمەتیت دەدەن بۆ سەرکەوتنت لەم کارە پیرۆزەدا.




## کاتێک لەبەرکردنی قورئان دەبێتە ئامانجێکی هاوبەش



با بەسەرهاتێکتان دەربارەی خۆم بۆ بگێڕمەوە.. دایکم لەگەڵ ئەوەی قورئانی لەبەر نەبوو، بەڵام هەرکاتێک دەگەڕامەوە بۆماڵەوە بانگی دەکردم و قورئانەکەی دەکردەوە، تا چەند ئایەتێکی بۆ بخوێنمەوە و گوێم بۆ بگرێت، لەوە دڵنیابن ئەو مەبەستی ئەوە نەبوو قورئانم پێ لەبەر بکات.. نەخێر.. بەڵکو ئامانجی لەم کارەی هاندانم بوو لەسەر لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز.

باوکیشم «بەڕەحمەت بێت» بەهەمان شێوە بانگی دەکردم و دەیوت: چەند ئایەتێکم لە فڵانە سورەت بەسەردا بخوێنەرەوە و پێم خۆشە فڵانە سورەتم بۆ بخوێنیتەوە، هەروەها مامۆستاکەم {ڕەشاد

«کە قورئانی پێ لەبەرکردم»} جارێکیان بەسەردان لەوڵاتی میسر بوو بەتەلەفۆن پەیوەندی پێوە کردم و فەرمووی: پێم خۆشە بەدەنگی تۆ گوێم لە چەند ئایەتێکی قورئان بێت.

ئێستا کاتی ئەوەیە تۆی بەڕێز پرسیار بکەیت و بڵێیت: ئەمە هەمووی لەپێناوی چی دا بووە؟!

وەڵام: چونکە ئەوان هەموویان بەشداربون لە ئامانجەکەمدا، دەیانویست لەگەڵم دا بەردەوام بن و هاوڕێی گەشتەکەم بن، تا ئەو کاتەی دەگەمە مەنزڵ و بەتەواوەتی بە ئامانجەکەم دەگەم.

کەواتە تۆش لەم ئامانجە گەورەیەی ژیانتدا برا و خێزان و هاوڕێکانت بەشداری پێ بکە، هەتا هاوکار و پشتیوانت بن و بەهۆی ئەوانەوە لە ساردبوونەوە دوور بکەویتەوە و هەموو قورئانی پیرۆز لەبەر بکەیت و بەسەری بەرزەوە کۆتایی بەگەشتی لەبەرکردنی قورئان بهێنیت.

کات

هاوڕێ

ئامانج

بەژدارییپێکردن

## ٧ بنەمای حەوتەم:
## لەگەڵ کەسێکی شارەزادا قورئان لەبەر بکە

ئەگەر پرسیار لە خۆمان بکەین و بڵێین: بە چ شێوازێک قورئان گەیشتوە بەپێغەمبەری خوا(ﷺ)؟

وەڵام: لە رێگەی فریشتە جبریلەوە قورئان گەیشتوە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دواتر پێغەمبەری خواش(ﷺ) گەیاندوویەتی بە هاوەڵەکانی و، ئەوانیش بەو شێوازە لە پێغەمبەریان(ﷺ) وەرگرتوەو گەیاندوویانە بە شوێنکەوتوان {تابعین}..، قورئان بەو شێوازە پشتاو پشت هاتوە تا گەیەنراوە بە ئێمە.

بەکورتی.. ئەم قورئانە لەرێگای کەسانی زۆر شارەزاو وردەوەو بەشێوەی پشتاو پشت گەیەنراوە بە ئێمە، گرنگترین بنەمای بنەرەتی بۆ ئەو کەسانەی کە بە پەرۆشییەوە دەیانەوێت قورئان لەبەر بکەن ئەوەیە: قورئان لەلای مامۆستایەکی زۆر وردو شارەزا لەبەر بکەن.

سوپاس بۆ خوا ئەمەش لەم سەردەمەدا فەراهەم هاتووەو مامۆستایەکی زۆرمان هەیە کە هەم خۆیان قورئانیان لەبەرەو هەروەها خاوەن تواناو شارەزاییەکی لەرادە بەدەرن، ئەگەر دەتەوێ قورئان لەبەر بکەی، ئەوا: مامۆستایەک دەستنیشان بکەو برۆرە خزمەتی لە مزگەوت داو، خشتەی ئەو رۆژانە دیاری بکە، کە تیایاندا قورئان دەخوێنیتەوە و هەڵەکانت بۆ راست دەکاتەوە، یاخود ئەگەر بکرێت مامۆستا لە چەند رۆژێکی دیاری کراودا بێتەماڵەوە و لەگەڵیدا قورئان لەبەر بکەیت.

## ئایا خوێندنەوە جێگای وتنەوە دەگرێتەوە؟

پێویستە ئەو ڕاستییە بزانیت، کە زمان پاراوترین و شارەزاترین کەس لە زمانی عەرەبیدا توانای ئەوەی نیە هەرخۆی بەتەنیا قورئان لەبەر بکات؟ چونکە قورئانی پیرۆز وشەکانی جیاوازن و پێویستیان بەوە هەیە کە لەلایەن مامۆستایەکەوە ڕاست بکرێنەوە.

من خەڵکانێکی هاوتەمەنی خۆم دەناسم، کە قورئانیان لەبەر کردووە، بەڵام لە لەبەرکردنی قورئاندا پشتیان بەهەوڵ و ماندوبوونی خودی خۆیان بەستوە، لە ماڵەوە یاخود لە مزگەوت دەستیان کردوە بەو کارە پیرۆزە بەبێ هەبوونی مامۆستایەک، بەڵام لە کاتێکدا بەیەکەوە گەشتمان دەکرد و لەماوەی گەشتەکەماندا قورئانیان دەخوێندەوە و گوێمان لێ دەگرتن، بۆمان دەردەکەوت کە هەڵەیەکی یەکجار زۆریان هەیە.



بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی بابەتەکە نمونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە: لە یەک لە ڕۆژەکاندا گوێم بۆ یەکێک لەو کەسانە گرتبوو کە قورئانی لەبەرە و ئەم ئایەتەی خوێندەوە، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَأَعۡرَضُواْ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ وَبَدَّلۡنَٰهُم بِجَنَّتَيۡهِمۡ جَنَّتَيۡنِ ذَوَاتَيۡ أُكُلٍ خَمۡطٖ وَأَثۡلٖ وَشَيۡءٖ مِّن سِدۡرٖ قَلِيلٖ ١٦﴾ سَبَإ: ١٦.

نەیوت: (ذَوَاتَيۡ)، بەڵکو وتی: (ذواتى) بە ئەلیف خوێندییەوەو، ئەمەش لەو چاپانەدا نوسراوە کە ڕیوایەتی حەفصن کە تیایدا وشەکە بە ئەلفی مەقسورە دەنوسرێت: (ذواتى)، بەڵام بە: (ذَوَاتَيۡ) دەخوێنرێتەوە.



## بنەمای هەشتەم: قورئان بەتەجویدەوە لەبەر بکە

لەو بنەما سەرەکییانەی کە پێویستە لەکاتی لەبەرکردنی قورئاندا ڕەچاو بکرێن: لەبەرکردنی قورئانە بەتەجویدەوە؟ چونکە ئێمە پێشتر لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین ئەگەر پەرۆشی لەبەرکردنی قورئانیت، ئەوە پێویستە مامۆستایەکی شارەزا بۆ خۆت دیاری بکەیت، ئەگەریش لەگەڵ مامۆستاکەتدا ڕێک کەوتن، دواتر پێی بڵێ: دەمەوێ قورئان بەشارەزایی و تەجویدی تەواوەوە لەبەر بکەم.

بۆ نمونە: ئەگەر هەفتانە مامۆستا سێ ڕۆژی بۆ تەرخان کردی، ئەوا پێی بڵێ: لە یەک لەو سێ ڕۆژەدا هەموو جارێک لە نیو کاتژمێردا یاساکانی تەجویدم پێ ئاشنا بکە.

تەجوید: زانستێکی ئاسان و جوان و چێژ بەخشە، بێگومان قورئانی پیرۆز جیاوازە لە هەر جۆرە پەڕاوێکی ترو، خوێندنەوەی قورئان وەک خوێندنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان نییە، کە هیچ جۆرە ڕێساو یاساو شوێنی دەرچونی پیتەکانیان نییە.

تەجوید لە زمانەوانیدا بریتییە: لە جوان خوێندنەوە و شارەزابوون. دەوترێت: جـودت الـشيء أي حسنته واتقنته. واتە: کارەکەم بەباشی ئەنجامدا.

تەجوید لە زاراوەدا بریتییە: لە ماف پێدانی پیتەکان و زانینی چۆنییەتی وەستان لەسەریان، هەموو ئەو کەسانەی قورئان دەخوێننەوە لەسەریان پێویستە یاساکانی تەجوید جێبەجێ بکەن،

تەنانەت ئەگەر یاساکان بزانن یاخود نا، ئەوە جێبەجێ کردنیان پێویستە، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿..وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ۝٤﴾ المُزَّمِل: ٤. لە ئیمامی عەلی یەوە ڕیوایەت کراوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە فەرمویەتی: {تەرتیل: بریتییە لە جوان خوێندنەوەی پیتەکان و هەبونی شارەزایی دەربارەی ئەو شوێنانەی پێویستە قورئانخوێن لەسەریان بوەستێت}، خوای گەورە زۆر پێداگری لەسەر فەرمانەکە کردووەتەوە، بێگومان ئەمەش وەک گرنگی پێدان و بەگەورە گرتنێکە بۆ پێگەی ئەم قورئانە، وەک ئیبن جەزری دەفەرموێ:

وَالاخْذُ بِالتَّجْوِيدِ حَتْمٌ لازِمُ     مَنْ لَمْ يُجَوْدِ الْقُرآنَ آثِمُ
لأَنَّــهُ بِــهِ الالَــهُ أَنْــزَلا     وَهَكَذَا مِنْهُ إلَيْنَا وَصَلا

واتە: قورئان خوێندن بەتەجویدەوە واجب و پێویستە، هەرکەسێکیش قورئان بەتەجویدەوە نەخوێنێت ئەوە گوناهبارە؟ چونکە خوای گەورە بەتەجویدەوە ئەم قورئانەی دابەزاندوە، وە بەم شێوەیەش (بەتەجویدەوە) نەوە بەنەوە بە (تواتر) بەئێمە گەیشتووە.



هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: [الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ][1]، واتە: «کەسی کارامە (لە خوێندن و کارپێکردنی) قورئاندا، لەگەڵ فریشتە ڕێزدارە بەڕێزەکانی خوایە، وە ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێ و لەسەر زمانی تەواو نایێ (واتە: چاک نایزانێ) وە لەسەریشی قورسە، دوو پاداشتی بۆ هەیە».

هەندێک بە هەڵە لەم فەرمودەیە تێگەیشتون و گومانیان وەهایە ئەوەی قورئان بەنارەحەت دەخوێنێتەوە و لەسەر زمانی قورسە، زۆر چاکتر و لەپێشترە لەو کەسەی، کە شارەزایی تەواوی لە قورئاندا هەیە.

پاداشت: ئەو کەسەی بەشارەزاییەوە قورئان دەخوێنێتەوە، ئەوە لەڕۆژی دوایی دا لەگەڵ پێغەمبەران و فریشتەکاندایە؟ چونکە ئەو بەتەجویدو شارەزایی تەواوەوە قورئانی خوێندوەتەوە، سەرئەنجام بووە بەکەسێکی شارەزا لە خوێندنەوەی قورئاندا، بەڵام ئەو کەسەی بەنارەحەتی قورئان دەخوێنێتەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە: پاداشتی خوێندنەوەو پاداشتی ئەو نارەحەتییانەی بەو هۆیەوە دووچاری هاتون، بێگومان پلەی ئەم جۆرە کەسانە دەکەوێتە دوای پلەی ئەو کەسانەی کە بەشارەزاییەوە قورئان دەخوێننەوە.

بەڵام تۆی خۆشەویست، ئەی ئەو کەسەی قورئان لەبەر دەکەی: لەناخی دڵەوە ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی هەر لە سەرەتاوە بەتەجویدەوە قورئان لەبەر بکە؟ هەتا شارەزاییەکی ورد پەیدا بکەیت و چێژ وەربگریت لە کتێبەکەی خوای گەورە.

---

١ () أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٤٦٥٣، وَمُسْلِم: ١٨٩٨

## ٩ بنەمای نۆیەم: کار بە قورئان بکە

ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانە سەرەتا بۆ خۆم، پاشان بۆ هەموو ئەو براو خوشکانەی دەیانەوێت هەموو قورئان لەبەر بکەن، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەت کراوە، فەرمویەتی: (رب تال للقرآن، والقرآن يلعنه). واتە: دەکرێت کەسێک قورئان بخوێنێتەوە و قورئانیش نەفرەتی لێ بکات. بێگومان ئەمە پەیامێکی دڵسۆزانەی زۆر ترسناکە؟ چونکە کاتێک کەسێک قورئان دەخوێنێتەوە، یان لەبەری دەکات، پاشان لە ژیانی ڕۆژانەیدا داواکارییەکانی قورئان جێبەجێ ناکات، ئەم جۆرە کەسانە ئەوانەن کە قورئان نەفرینیان لێ دەکات، هەروەک چۆن ئەم فەرمایشتە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە گێڕدراوەتەوە.

بەردەوام زۆر پەرۆشبە لەسەر کارکردن بەقورئان و جێبەجێ کردنی هەموو ئەو فەرمانانەی کە تیایدا هاتووە، هاوەڵان سەرەتا دە ئایەتی یەکەمی هەموو سورەتێکیان لەبەر دەکرد، دواتر لە ژیانی خۆیاندا داواکاری دە ئایەتەکەیان بەکردەوە جێبەجێ دەکرد، بە ئامانجی ڕازی کردنی خوای گەورە، پاشان دە ئایەتی تریان لەبەر دەکرد، بەکردەوە لە ژیانیاندا جێبەجێیان دەکردو، بەو شێوازە...

کەواتە: ئامانج بریتییە لە کارکردن بەقورئان لە ژیانی ڕۆژانەماندا، نەک ڕێژە و ئەندازەی ئەو ئایەتانەی قورئان کە لەبەرمان کردون یاخود لەبەریان دەکەین.

بەڵگەش ئەم بنەما قورئانییە، کە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحۡسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ بَغۡتَةٗ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ۝٥٥﴾ الزُّمَر: ٥٥. واتە: شوێن چاکترین بەرنامە بکەون، کە لە پەروەردگارتانەوە نێردراوەتە خوارەوە بۆتان، بەرلەوەی لە ناکاودا سزاتان بۆ بێت، کە ئێوە هەر هەستی پێ نەکەن.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ۝١٥٥﴾ الأَنعَام: ١٥٥. واتە: ئەم قورئانە پیرۆزە بەفەڕو پیتەمان ناردووەتە خوارەوە، کەواتە ئێوەش شوێنی بکەون و خۆتان بپارێزن و (پارێز کار بن).

ژیانی پێغەمبەری خواش(ﷺ) هەر بەو شێوازە بووەو لە کاتێکدا پرسیار لە دایکە عائیشە دەکەن دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لە وەڵامدا فەرمویەتی: «کان خُلُقُه القرآنَ». واتە: خوڕەوشتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) قورئانی بووە.



## ١٠ بنەمای دەیەم: دوعا و پاڕانەوە

کاتێک کەسێک گوێی لێ دەبێت کە فڵانە کەس خۆی یاخود منداڵەکانی قورئانیان لەبەر کردووە، ڕاستەوخۆ دەڵێت: چۆن هاوشێوەی ئەو قورئان لەبەر بکەم؟ ئەی منداڵەکانم چۆن بتوانن هاوشێوەی ئەوان قورئان لەبەر بکەن؟ بەڕاستی لەبەرکردنی قورئان کارێکی سەختەو، لاپەڕەکانی ئێجگار زۆرن!!

دەمەوێ پرسیارێکتان ئاڕاستە بکەم: ئایا تا ئێستا بۆ یەکجاریش لە کاتی سوجدەدا لە خوا پاڕاونەتەوە و داواتان لێی کردووە، کە کارتان بۆ ئاسان بکات بەئاڕاستەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز؟ با هەمومان لە وەڵامدانەوەدا ڕاشکاوبین!

زۆرێک لە ئێمە لە دوعا و پاڕانەوەکانماندا داوای بەهەشت دەکەین و پەنا بەخوا دەگرین لە ئاگری دۆزەخ، دوعا بۆ منداڵەکانمان دەکەین و بەردەوام لە خوا دەپاڕێینەوە، کە ڕۆزییان بدات و سەرکەوتویان بکات، ئایا لەگەڵ ئاڕاستە کردنی ئەم داواکارییانەتدا، ڕۆژێک لە ڕۆژان داوات لە خوا کردووە کە ڕێزت لێ بگرێت و، بتکات بەیەکێک لەو کەسانەی قورئان لەبەر دەکەن؟ ئایا هەرگیز دەستەکانت بەرز کردوەتەوەو بڵێی: پەروەردگارا، خوای بەخشندە و میهرەبان، ئەی ئەو پەروەردگارەی ئاسانکاری کاروباری بەندەکانتی! لەبەرکردنی قورئانم بۆ ئاسان بکە، کە بەهۆیەوە بەرز دەبمەوە بۆ بەرزترین پلەی بەهەشت.؟

ئایا هیچ کەس لە ئێمە بەو شێوازە داوامان لە خوا کردوە؟ پێویستە ئەو ڕاستییە بزانین گرنگترین هۆکارێک کە هاوکاریت دەکات لە لەبەرکردنی قورئاندا، بریتییە: لە دوعا و پاڕانەوە و هاناو پەنا بردن بۆ لای خوای گەورە.

ئەگەر هەستت بەوە کرد لەبەرکردنی قورئان کارێکی سەختە، باوەڕت وەها نەبێ ئەو کەسەی لەبەرکردنی قورئانت لەسەر ئاسان دەکات: فەهدە، یان باوک، یان دایک، یان یەکێکە لە مامۆستاکان، بێگومان ئاسانکاری هەموو کاروبارەکان بەتەنها خوای پەروەردگارە.

لەبەرئەوە لە فەرمایشتێکیدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمویێ: [إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ][1]، واتە: ئەگەر داوات کرد بەس لە خوا داوا بکە، وە ئەگەر یارمەتیت وەرگرت بەس داوای یارمەتی لە خوا بکە

هەروەها قورئان دەفەرموێ: ﴿..وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ..﴾ الطَّلَاق: ٣. ئەگەر پشتت بەخوای گەورە بەست، یەقینت هەبێت پەروەردگار سەرکەوتوت دەکات..



١ أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٦٦٩، والتِّرمِذي: ٢٥١٦، وقال: حسن صحيح وَقَالَ الألباني: حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

## ده بنەماکە:

١ بنەمای یەکەم: دڵسۆزی (ئیخلاس) ڕێگای سەرەتایە

٢ بنەمای دووەم: تەوبەو وازهێنان لە تاوان

٣ بنەمای سێیەم: دیاریکردنی کات.

٤ بنەمای چوارەم: خۆت لە کۆڕو کۆبونەوەی نەگونجاو بپارێزە.

٥ بنەمای پێنجەم: بیهێنەرە پێش چاوی خۆت کە ئامانجەکەت پێکاوە.

٦ بنەمای شەشەم: کەسانی تر لە ئامانجەکەتدا بەشداری پێ بکە

٧ بنەمای حەوتەم: لەگەڵ کەسێکی شارەزادا قورئان لەبەر بکە

٨ بنەمای هەشتەم: قورئان بەتەجویدەوە لەبەر بکە

٩ بنەمای نۆیەم: کار بە قورئان بکە.

١٠ بنەمای دەیەم: دوعاو پاڕانەوە

# پلانی لەبەرکردن

## پڕۆژەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

هەر پڕۆژەیەک لە دونیادا بگریت پێویستی بە پلان و ئامانج و هەڵسەنگاندن هەیە، ئەی ئەگەر ئەو پڕۆژەیە گەورەترین پڕۆژەی ژیانت بێت کە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزە؟.

بەڵێ بەبێ گومان ناتوانیت بەردەوام بیت لەسەر لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، بەبێ هەبوونی ئامانج و پلان و هۆکارەکانی پشتگیری کردنی ئەو ئامانجانە، لە هەمووی جوانتر ئەوەیە، کە پڕۆژەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز پاداشتەکەی گرێنتی کراوە، بەپێچەوانەی پڕۆژە دونیاییەکان، کە زۆر تامەزرۆین بۆ ئەنجامدانیان و لەو پێناوەدا هەموو هۆکارەکان دەگرینە بەر.

لەم بەشەدا بەشداریتان لەگەڵدا دەکەم ئەویش بەپێشنیار کردنی پلانی لەبەرکردنی قورئان، کە پلانی یەک ساڵی و سێ ساڵی و پێنج ساڵی لەخۆی دەگرێت، بەڵام پێویستە لە ئێستاوە و لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم وشانەدا دەست پێ بکەیت... بەنییەتێکی ڕاستگۆیانە و بڕیاردان و بەوپەڕی بڕوابەخۆبونەوە دەست پێ بکە، یەقینت بە پاداشتێکی نەبڕاوە هەبێت لەلای خوای گەورە.

با بەیەکەوە جوانترین پلان دابڕێژین لەم دونیایەدا



# پلانی لەبەرکردن



## کاتێکی گونجاو بۆ لەبەرکردن

زۆرێک پرسیار دەکەن دەربارەی گونجاوترین کات بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، لە ڕاستیدا ئەمە بابەتێکە پەیوەستە بەئەندازەی حەزو هیممەت بەرزی خودی خۆتەوە، بەڵام ئەگەر دەربارەی توانات بۆ لەبەرکردنی قورئان پرسیارم لێ دەکەیت، من دڵنیام هەمومان دەتوانین لە ماوەیەکی کورتدا هەموو قورئان لەبەر بکەین.

لە وڵاتی میسر چاوم بەکوڕێکی گەنج کەوت ناوی شەریف بوو، چواردەساڵی تەمەنی تێپەڕ نەکردبوو، لەماوەی سێ مانگدا هەموو قورئانی لەبەر کردبوو، کەسانی ئەوتۆش هەن لە ماوەی نۆ مانگدا قورئانیان لەبەر کردوە، دەربارەی ئەو کەسانەی شارەزان لە قورئان، کاتێکی {زەمەنی} دیاریکراو نییە بۆ لەبەرکردن، بەڵام لەسەرت پێویستە، پلانێکی گونجاو بۆ خۆت دابنێیت و لەسەری بەردەوام بیت.



لەوانەیە بۆ خۆم بۆچونم وەهابێ، کاتی گونجاو و پەسەندکراو لەلای زۆرینە بۆ لەبەرکردنی قورئان سێ ساڵ بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێ پلانی پێشنیارکراو دەخەمە ڕوو، تۆش گونجاوترین پلان هەڵبژێرە، کە لەگەڵ خۆت و بارودۆخت دەگونجێت، چونکە مەرج نیە تەنها بەکاتە دیاریکراوەکەتەوە پابەند بیت، بەڵکو پلانێک پێشنیار بکە، کە توانای جێبەجێ کردنیت هەبێت و بەهۆیەوە شارەزا ببی لە قورئان و توانای پێداچونەوەی بەردەوامت هەبێت بەبێ دابڕان.

## پلانی پێشنیار کراو

### ئەو پلانە هەڵبژێرە، کە لەگەڵ خۆت و بارودۆختدا دەگونجێت

قورئان لە سی جوزء پێکهاتوە، هەموو جوزئێک بیست و یەک لاپەڕەیە، بەشێوەی ڕۆژانە پلانەکە دابەش دەکەین بەپێی ئەم خشتانە:

١

پلانی لەبەرکردنی یەک ساڵ

| | |
|---|---|
| ئەندازەی لەبەرکردنی ڕۆژانە | دوو لاپەڕە (ئەمدیو و ئەودیو) |
| ئەندازەی لەبەرکردنی هەفتانە | دە لاپەڕە |
| ئەندازەی لەبەرکردنی مانگانە | ٤٠ لاپەڕە (دوو جوزء) |
| ماوەی لەبەرکردنی هەموو قورئان | ١٥ مانگ |

## ٢

### پلانی لەبەرکردنی سێ ساڵ

**ئەندازەی لەبەرکردنی ڕۆژانە**

یەک لاپەڕە (یەک دیو)

**ئەندازەی لەبەرکردنی هەفتانە**

٥ لاپەڕە

**ئەندازەی لەبەرکردنی مانگانە**

٢٠ لاپەڕە (یەک جوزء)

**ماوەی لەبەرکردنی هەموو قورئان**

٣٠ مانگ

## ٣

### پلانی لەبەرکردنی پێنج ساڵ

**ئەندازەی لەبەرکردنی ڕۆژانە**

نیو لاپەڕە

**ئەندازەی لەبەرکردنی هەفتانە**

دوو لاپەڕە و نیو (چواریەکی حزبێک)

**ئەندازەی لەبەرکردنی مانگانە**

١٠ لاپەڕە (یەک حزب)

**ماوەی لەبەرکردنی هەموو قورئان**

٦٠ مانگ

---

- ئەنـدازەی لەبەرکـردنی هەفتانـە: پێنـج ڕۆژ بـۆ لەبەرکـردن و، دوو ڕۆژ بـۆ پێداچونـەوە.
- هەمـوو جوزئێـک لـە دوو حـزب پێـک هاتـووە، هەمـوو حزبێـک یـش دەکرێـت بـە چـوار بەشـەوە، چـوار یەکـی حزبێکیـش، بەنزیکەیـی لـە دوو لاپـەڕەو نیـو پێکهاتـوە.

لەکۆتایی ئەم کتێبەدا لەلاپەڕە {١٥٠} بەدواوە خشتەیەکم بۆ ئامادە کردون، هاوکارتان دەبێت لەجێبەجێ کردنی ئەم سێ پلانەدا، تۆش ئەوەیان هەڵبژێرە، کە لەگەڵ بارودۆخ و کاتەکەتدا گونجاوە، ئەگەر توانای لەبەرکردنی دوو لاپەڕەت هەیە لە ڕۆژێکدا، ئەوە پشت بەخوا ببەستەو هەر لەئێستاوە دەست بکە بەجێبەجێ کردنی {پلانی یەک ساڵە} ی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز.

یان هەڵبژاردنی ئەو پلانەی، کە پێشتر ئامۆژگاریم کردن بەوەی لەسەری بڕۆن، ئەویش {پلانی سێ ساڵەیە} بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، من وەهای دەبینم، کە ئەم پلانە پەسەندکراوە، لە هەمانکات فشاری زۆرت لەسەر دروست ناکات و، دەرفەتی زۆریشی تێدایە بۆ پێداچونەوە و جێگیرکردنی ئەوەی کە لەبەری دەکەیت بەئاراستەی لەبیرنەچونەوەت.

دەربارەی ئەو کەسەی زۆر سەرقاڵە، ئەوە با لەسەر خۆی زۆر قورس نەکات، بەڵکو {پلانی پێنج ساڵە} هەڵبژێرێت و، ئەم پلانەش بەشێوازێکە دەتوانرێت بەشێوەیەکی ڕون و ئاشکرا بەسەر چوار بەشدا دابەش بکرێت.. بەو شێوەیە ئامانجەکەت بریتی دەبێت لە لەبەرکردنی چوار یەکی حزبێک لە هەفتەیەکدا... بەپێی ئەم پلانەش لەماوەی {پێنج ساڵدا} هەموو قورئان لەبەر دەکەیت، مەڵێ پێنج ساڵ ماوەیەکی دورو درێژە، بێگومان ئێمە کەم تەرخەمی زۆرمان کردووە لە ئاستی قورئاندا و لەسەرەتاوە پەرۆشی و گەرم و گوڕیمان هەبوە و بەڵام دواتر ساردبونەوە و دابڕان ڕووی تێ کردوین، دڵنیات دەکەمەوە پێنج ساڵ زۆر خێراتر لەوە تێدەپەڕێت کە ئێمە وێنامان کردووە.

## شێنەیی لە لەبەرکردنی قورئاندا

لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بەندایەتییەکی گەورەو پیرۆزە، پێویستە مرۆڤ بەوردی شارەزا بێت لێی، لەبەرئەوە هەرگیز لە لەبەرکردنیدا پەلە مەکە؟ چونکە ئەگەر لەماوەی دە ساڵدا بەشێوەیەکی ورد و بەشارەزاییەوە لەبەری بکەیت، زۆر باشتر و چاکترە لەوەی بە ساڵێک لەبەری بکەیت بەکەم و کورتییەکی زۆرەوە، دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین کەمێکی بەردەوام زۆر چاکترە لەزۆرێکی پچڕ پچڕ، بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم زۆر لەخۆت مەکە بۆ لەبەرکردنی ڕێژەیەکی زۆری قورئان لە کاتێکدا سەرقاڵیت و بوارت کەمە.

یەکێک لە قوتابییەکان ڕۆژانە دە ئایەتی دەخوێندەوە بۆ مامۆستاکەی، ڕۆژێک دوازدە ئایەتی خوێندەوە، مامۆستاکەی پێی ووت: من تەنها داوای دە ئایەتم لێ کردویت، ئەم دوو ئایەتە هەڵبگرە بۆ سبەی، قوتابییەکەش بەگوێی مامۆستاکەی کردوو بەم شێوەیە بەردەوام بوو لە لەبەرکردنی قورئان، تا سەرئەنجام بەشارەزاییەکی تەواوەوە هەموو قورئانی لەبەر کرد.



**لەبەرچاو گرتنی چەند بنەمایەکی گرنگ بۆ لەبەرکردن**

**دوای ئەوەی یەکێک لە سێ پلانەکەی ڕابردووت هەڵبژارد، پێویستە ئاگاداری سێ خاڵی گرنگ بیت، دەربارەی پلانەکەت بۆ لەبەرکردنی قورئان، ئەوانیش ئەمانەن:**

### لەسەر خۆبە و خۆت بگونجێنە لەگەڵ پلانەکەتدا بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

ئەگەر ڕۆژێک کاتت کەم بوو بەهۆکاری تاقیکردنەوەکان، یان بەهۆی پاڵەپەستۆی خێزانی، یاخود بەهۆکاری دۆخێکەوە، ئەوا لەو کاتەدا ڕێژەی لەبەرکردن و پێداچونەوەت کەم بکەرەوە، هیچ گرفتێک لەمەدا نییە ئەگەر ڕێژەی لەبەرکردن و پێداچونەوەت کەم بکەیتەوە، بێگومان ئەمە خۆگونجاندنێکی گرنگە.

### بەدرێژایی گەشتە قورئانییەکەت، دەرفەتە زێڕینەکان بقۆزەرەوە

لەگەڵ هاتنی مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا {مانگی قورئان}، بەرەکەتی ئەم مانگە پیرۆزە بقۆزەرەوەو ڕێژەی لەبەرکردنی قورئان زیاد بکە، ئەگەر سەردانی شوێنە پیرۆزەکانت کرد وەک شاری مەککەو مەدینە، لەبەرکردن و پێداچونەوەی قورئان زیاد بکە، بەشداری بکە لە پێشبڕکێ قورئانییەکاندا... هتد.

بەکورتی: لەگەڵ هەموو دەرفەتێکی زێڕیندا کە دێتە بەردەمت، هەوڵبدە لەبەرکردن و هیممەت بەرزیت زیاد بکەیت.

### بەردەوام پلانە قورئانییەکەت هەڵسەنگێنە

لەمیانەی گەشتی لەبەرکردنی قورئاندا پرسیار لەخۆت بکە و بڵێ: ئایا ئەمڕۆ پلانەکەم بەشێوەیەکی دروست جێبەجێ کردوە؟ ئایا بەشێوەیەکی دروست پێداچونەوەی قورئانم کردوە؟ پرسیار لە مامۆستا و ئەو هاوڕێیانەت بکە، کە لە لەبەرکردنی قورئاندا کێبەرکێت لەگەڵدا دەکەن و، سود لە هەڵسەنگاندن و بۆچونەکانیان وەربگرە.

**ئەم سێ خاڵە گرنگییەکی زۆریان هەیە لەکاتی لەبەرکردنی قورئاندا، بێگومانبە لەوەی بە لەبەرچاوگرتنی ئەم سێ خاڵە، خوای گەورە بەیارمەتی خۆی گەشتە قورئانییەکەت بۆ ئاسان دەکات.**

### ئەگەر ئارەزووی لەبەرکردنی قورئانت نەبێت..

دوودڵ بووم لە نوسینی ئەم وشانە.. لەترسی ئەوەی نەوەک بیانو بدەمە دەستی هەندێک کەس بەئاراستەی گۆڕینی پلانەکانیان بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز.

بەڵام هەموان ئەوە دەزانین، لەبەرکردنی هەموو قورئان فەرزی کیفایەیە لەسەر موسڵمانان، واتە: لەبەرکردنی هەموو قورئان لەسەر هەموو موسڵمانێک فەرز نیە، بەڵام ئەگەر هیچ کەس قورئانی لەبەر نەکرد، ئەوە بەو هۆکارەوە هەموو ئوممەت گوناهبار دەبێت، ئەم قسەیە واتای چی دەگەیەنێت!! واتە: لەگەڵ ئەو پلە و پایە و پاداشتە گەورەیەی کە دانراوە بۆ لەبەرکردنی قورئان «پێشتر ئاماژەمان

پێی کرد»، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرت پێویست و واجب نیە هەموو قورئان لەبەر بکەیت، ئەوەندەت بەسە کە سورەتی فاتیحە و ئەوەی لە نوێژەکانتدا دەیخوێنی لەبەری بکەیت.. بەڵام خوشک و برا خۆشەویستەکانم با لێرەدا بەیەکەوە هەڵوێستەیەک بکەین....



ئایا حەز ناکەی کاتێک دەتخەنە گۆڕەکەتەوە، ئەو ئایەتانەی لەبەرت کردوون تاریکایی گۆڕەکەت بۆ ڕووناک بکەنەوە؟



ئایا حەز ناکەیت سەرکەوی بۆ بەرزترین پلەکانی بەهەشت، بەپێی ژمارەی ئەو ئایەتانەی کە لەبەرت کردوون؟



ئایا شەرم لەوە ناکەی لەبەردەم خوای گەورەدا بوەستیت، لە کاتێکدا تەنها سورەتی فاتیحەت لەبەربێت؟



ئایا شەرم ناکەی، دەربارەی ئەو تەمەنەی کە لە ئیسلامدا بەسەرت بردووە، هەریەکەمان سی ساڵ و چل ساڵمان تێپەڕاندووە، لە کاتێکدا تەنها سورەتە کورتەکانمان لەبەرن؟

**بیانووت چییە؟ نامەوێ قورئان لەبەر بکەم؟ کاتم نییە؟ لەبەرکردنی قورئان لە ئامانجەکانم نییە؟**

من دەڵێم: قورئان پەیامێکی هێندە گەورە و پیرۆزە ئاراستەت دەکات کە هەرئێستا و بەبێ وەستان و دوو دڵی بیکەی بەیەکێک لە ئامانجە هەرە گەورەکانت لە ژیانتدا.. بەلانی کەمەوە دە جوزء لەبەربکە {(سێیەکی قورئان).. پێشنیارت بۆ دەکەم چوار جوزئی سەرەتا و شەش جوزئی کۆتایی لەبەر بکەیت... لەبەر پلەو پایەی

سورەتی بەقەڕەو ئالی عیمران} بەسەر هەموو سورەتەکانی تردا..
ئەمەی دەیخەمە ڕوو، کەمترین پێشنیارە دەربارەی لەبەرکردنی قورئان و، لەلاپەڕەی {١٧٤} ی ئەم کتێبەداو لە بەشی خشتەی پێشنیارکراودا، شێوازو چۆنییەتی لەبەرکردنی ئەم دە جوزئەم خستوەتە ڕوو.

## بازرگانییەک هەرگیز لە برەو ناکەوێت

بێگومان ئێمە هەست بەگەورەیی پلەو پایەی ئەو کەسە دەکەین لەلای خوای پەروەردگار کە قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە، پێویستە ئەو ڕاستییە بزانین بازرگانی کردن لەگەڵ خوادا هەرگیز لە برەو ناکەوێت و خاوەنەکەی دووچاری زیان نابێت، هەر لەبەرئەوەیە ئەم ئایەتە ناونراوە {آية القرآء}، ئەمەش لەپێناو ئەوەدایە خوێنەرانی ، لەپلە و پایە و پاداشتدا جیا بکرێنەوە.
هەروەک لەپێشەوە ئاماژەمان بەم فەرموودە شیرینەی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) کرد کە لێوەی گێڕدراوەتەوە:{عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ(ﷺ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): «مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لاَ أَقُولُ (الم) حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلاَمٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ»}[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود(ﷺ)،

١ ) أَخْرَجَهُ التِّرمِذيُّ: ٢٩١٠، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، البَيْهَقِي في شعب: ٢٩٩٣٣، انظر: صَحِيح الْجَامع: ٦٤٦٩.

دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: «هەر کەس پیتێک لە کتێبی خوا (واتە: قورئانی پیرۆز) بخوێنێتەوە چاکەیەکی بۆ هەیە، وە چاکەش یەک بە دەیە، ناشڵێم (ألم) هەمووی یەک پیتە، بەڵکو ئەلیف پیتێکە و، لام پیتێکە و، میم پیتێکە».

واتە لەبەرانبەر خوێندنەوەی (ألم) دا سی کردەوەی چاکەت بۆ دەنوسرێت، خوای گەورە پاداشتی چەند بەرام بەریش دەداتەوە بە هەرکەسێک کە خۆی بیەوێت.

ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێتەوە و بەڵام لەبەری نەکردووە، ئەوە لە چەند کاتێکی کەم دا لێرە و لەوێ دەیخوێنێتەوە، لە نمونەی ئەو کاتانەش: خوێندنەوەی لەناو نوێژەکانیدا، هەروەها لە ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان قورئان دەخوێنێتەوە؛ بەڵام ئەو کەسی (حافظ قورئان)، لەڕابردودا بەردەوام و بەچەندین شێوەی جیاواز و زیاد لە جارێک دەوری قورئانی کردوەتەوە بەئامانجی لەبەرکردنی، پاشان لەترسی لەبیرچوونەوە بەردەوام دەوری دەکاتەوە!

بیهێنەرە بەرچاوی خۆت ئەو کەسەی قوتابی قورئانی هەیە، کوڕەکەی خۆی یان براکەی، یاخود دراوسێکەیی و هەر موسڵمانێک... ئایەتێکی قورئانیان فێر بکات، تۆ بڵێی چەند چاکەی بۆ بنوسرێت لەگەڵ خوێندنەوەکەیدا؟!

بێگومان ئەمە بازرگانییەکی یەکجار گەورەیە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، هەر لەبەرئەوەشە، پاداشتەکەی دیاری نەکردوە، تەنانەت دوای ئەم ئایەتانە دەفەرموێ: ﴿لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ..﴾ فَاطِر: ٣٠. واتە: بۆ ئەوەی خوا بەتێرو تەواوی پاداشتیان بداتەوەو، لە فەزڵ و بەهرەی خۆی زیاتریشیان پێ بدات و...



## چۆن قورئان لەبەر بکەم؟

لەم چەند لاپەڕەیەدا وەلامی ئەم پرسیارە دەدەینەوە (چۆن قورئان لەبەر بکەم؟)

زۆرێک لەو کەسانەی قورئانیان لەبەرکردوە، ناتوانن بەشێوەیەکی ورد قورئان لەبەر بکەن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چۆنییەتی و شێوازی لەبەرکردنی قورئان، بێگومان ئەم شێوازی لەبەرکردنەی دەیخەمە ڕوو، هەر ئەو شێوازە سەرکەوتووەیە، کە ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی ئەزموونی بکەن و {تاقی بکەنەوە} لەپێناو لەبەرکردنی قورئان بەشێوەیەکی ورد بەیارمەتی خوای گەورە.

من دڵنیام، شێوازەکانی لەبەرکردنی قورئان جۆراو جۆرن، هەموو کەسێک شێوازی تایبەت بەخۆی هەیە، بەلام {ئەزموونی من} گونجاوترین و ئاسانترین ڕێگایە بۆ هەموان و دەتوانیت وردەکارییەکانی بەجوانی ڕێک بخەیت، هەر لەبەر ئەوەیە ناوم ناوە (چەند نهێنی یەک بۆ لەبەرکردنی قورئان بەشێوەیەکی وردو شارەزا) چونکە زۆربەی خەڵکی بێئاگان لە گرنگی ئەو هەنگاوانە و کاریگەرییان لەسەر جوان خوێندنەوە... ئومێدەوارم ئەوەی ئێوە دەتانەوێ لەم سیازدە خاڵەدا بوونی هەبێت:

### ١ نهێنی یەکەم: دووبارەکردنەوە ڕێگای شارەزابوونە

گریمان ئێستا لەگەڵ ئەو مامۆستایەت دانیشتویت کە قورئانت پێ لەبەر دەکات، هەڵەکانی ئەو لاپەڕەیەت بۆ ڕاست دەکاتەوە کە دەتەوێ لەبەری بکەیت، بەوردی یاساو شێوازی خوێندنەوەت فێر دەکات، پاشان دەگەڕێیتەوە بەرەو ماڵ؛ چۆن دەست دەکەیت بەلەبەرکردن و پەیوەست کردنی ئایەتەکان بەیەکترەوە؟!

تەنها بەجوانی سەرنج بدەو لەگەڵمدابە؛ بۆ نمونە: گریمان دەمانەوێت سورەتی {الإنسان} لەبەر بکەین، سەرەتا قورئانەکە بکەرەوە و پاشان دەست بکە بەخوێندنەوەی ئەو ئایەتانەی دەتەوێ لەبەریان بکەیت؟ چونکە قورئان جیاوازە لە هەر جۆرە کتێبێکی تر.



پێویستە بەشێوەیەکی ئارام و لەسەرخۆ، بەدەم ڕامان و بیرکردنەوە لەواتای ئایەتەکان دەست بکەی بەلەبەرکردنی ئایەتەکانی قورئان: ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١﴾ الإنسان: ١.



پاشان دووبارەی بکەرەوە: ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١﴾



دواتر قورئانەکە دابخەو هەوڵ بدە بەلەبەر بیخوێنیتەوە: ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١﴾، تێبینی ئەوە بکە لە جاری سێ یەمدا بەلەبەر بەشێوەیەکی زۆر جوان تواناى خوێندنەوەی ئایەتەکەت هەیە، پاشان وەک دڵنیابوونەوە بەرگی قورئانەکە بکەرەوە و ئاستی لەبەرکردنەکەت هەڵسەنگێنە.



پاشان بۆ جاری چوارەم دووبارەی بکەرەوە: ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١﴾، ئەگەر بەجوانی لەبەرت کردو دڵنیابوی لەو بارەوە، ئیتر بڕۆ بۆ لەبەرکردنی ئایەتی دووەم: ﴿إِنَّا خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا ٢﴾ الإنسان: ٢.

ئەوەی بەرانبەر ئایەتی یەکەم بەکارت هێنا، بەهەمان شێوە بۆ ئایەتی دووەم و سێیەمیش بەکاری بهێنە: ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ الإنسان: ٣. دوای ئەوەی ئەم سێ ئایەتەت بەجوانی لەبەر کرد، پاشان بگەڕێرەوە بۆ سەرەتاو دەست بکە بەدووبارەکردنەوەی ئایەتەکان لەسەرەتای سورەتەکەوە، هەموو ئایەتێک پەیوەست بکەرەوە بەئایەتی دوای خۆیەوە، بەواتای ئەوەی ئەگەر ئایەتی یەکەمت لەبەرکرد، دڵنیابوی لەوەی بەلەبەر دەتوانی بەجوانی بیخوێنیتەوە، توانای ئەوەت هەبوو کە ئەم ئایەتانە پەیوەست بکەی بەیەکترییەوە؛ ئەوا بیانخوێنەرەوە: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا ۝ إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ۝ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾، پاشان جارێکی تر ئایەتەکان دووبارە بکەرەوە، دواتر قورئانەکە بکەرەوە و ئایەتی چوارەم دووبارە بکەرەوە: ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَا وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا﴾ الإنسان: ٤. چەند جارێک لەسەر قورئانەکە بیخوێنەرەوە؛ پاشان قورئانەکە دابخە و بەو شێوازە...

بەم ڕێگایە دەتوانی ئەوەی بۆت دیاری کراوە لەبەری بکەیت، دواتر دەتوانی بچیت بۆ لای مامۆستاکەت و بەجوانترین شێوە ئەوەی لەبەرت کردووە بۆی بخوێنیتەوە، بێگومان بەو هۆیەوە مامۆستاکەت پێت دڵخۆش دەبێت، بەهەمان شێوە دەتوانی بەم ڕێگا نایابە قورئان بە کوڕەکەت یان کچەکەت لەبەربکەی، کاتێک ئەو لاپەڕەیە بەو شێوازە بەتەواوی لەبەر دەکەیت؛ پاشان هەوڵ بدە خوێندنەوەکەت بکە بە {حدر «واتە: خێراتر بیخوێنەرەوە»}، بەکورتی لەسەرەتاوە بە {تەرتیل «خوێندنەوەی هێواش»} دەست بکە بەلەبەرکردنی ئایەتەکان، پاشان بە {حدر «خوێندنەوەی خێرا»} ئەوەی لەبەرت کردوە دوبارەی بکەرەوە، بیرمان نەچێت ئەم ڕێگایە یارمەتیت دەدات هەتا زۆرترین ئایەتی لەبەرکراو دەور بکەیتەوە.

## ٢ نهێنی دووەم: دابەشكردنی ئایەتەكان بەگوێرەی واتاكانیان

لەو نهێنییە گرنگانەی هاوكاریت دەكەن بۆ لەبەركردنی قورئانی پیرۆز، ئەوەیە كاتێك دەتەوێت سورەتێك لەبەر بكەیت؛ بەپێی واتاكەی دابەشی بكە، چونكە قورئان هەمووی واتایە، ئیدی چونیەكە ئەگەر چیرۆك بێت یاخود یاسا یاخود...، بۆ نمونە: تۆ لە ئێستادا سورەتی {النَّازِعَاتِ} لەبەر دەكەیت، بەم شێوازە سورەتی {النَّازِعَاتِ} دابەش بكە، دابەشكردنێك كە پشت ببەستێت بەواتای ئایەتەكان، سەرەتای سورەتی { النَّازِعَاتِ }، پاشان ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ١٥﴾ النَّازِعَات: ١٥، پاشان ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ٣٤﴾ النَّازِعَات: ٣٤.. بەو شێوازە سورەتە تەواو بكە..

**دوای ئەوەی سورەتی {النَّازِعَاتِ}ت دابەش كرد بەگوێرەی واتای ئایەتەكان، سەرەتای سورەتەكە، پاشان ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ١٥﴾ سُورَةُ النَّازِعَات: ١٥، دواتر ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ٣٤﴾ النَّازِعَات: ٣٤. تا كۆتایی سورەتەكە، بەو شێوازە ئایەتەكان بەگوێرەی واتاكانیان دابەش بكە.**



ئەوەش بزانە كە دابەش كردنی سورەتەكە بەگوێرەی واتاكەی لەكاتی لەبەركردنیدا، هاوكاریت دەكات بۆ زیاتر تێگەیشتن لە قورئان، ئەمەش گرنگییەكی زۆری هەیەو، بەم ڕێگایەو بەم نهێنی یەش {بەیارمەتی خوای گەورە} تێگەیشتن لەقورئان و لەبەركردنی زۆر بۆت ئاسان دەبێت، من خۆم ئەم ڕێگا جوانەم بەكارهێناو، سوپاس بۆ خوا بەرهەمەكەم چنییەوە.

## ٣ نهێنی سێیەم: لەبەرکردنی نوێ بەلەبەرکردنی ڕابردوو ببەستەوە

کاتێک دەست دەکەیت بە لەبەرکردنی قورئان، ئەوەی دەتەوێ لەبەری بکەیت بەگوێرەی واتای ئایەتەکان دابەشی بکە؛ هەروەک چۆن لە سورەتی {النَّازِعَاتِ} ئەنجامانداوە، سورەتەکەمان بۆ سێ بەش دابەش کرد، یەکەم بەشی سورەتەکە: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا﴾ النَّازعَات: ١، دووەم بەش: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ النَّازعَات: ١٥، سێیەم بەش: ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾ النَّازعَات: ٣٤.

ئەگەر لەگەڵ مامۆستاکەتدا بەشی یەکەمت لەبەرکرد، کە دەست پێدەکات بە: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا﴾ النَّازعَات: ١، تا دەگاتە: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ النَّازعَات: ١٥، پاشان بۆ ڕۆژی دواتر لە ئایەتی ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ النَّازعَات: ١٥ دەستت پێ کرد، تا دەگاتە ئایەتی: ﴿مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ﴾ النَّازعَات: ٣٣...

لەڕۆژی دووەمدا کاتێک بۆ مامۆستاکەتی دەخوێنیتەوە و گوێت لێ دەگرێت، ئاگاداربە لە سەرەتای بەشی دووەمەوە دەست پێ مەکە: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ النَّازعَات: ١٥؛ بەڵکو لەسەرەتای سورەتی {النَّازِعَاتِ}ەوە دەست بکە بەخوێندنەوەی بۆ مامۆستاکەت، پێویستە گرنگی بەم یاسایە بدەیت بەتایبەتی لەسەرەتای گەشتەکەتەوە لە لەبەرکردنی قورئانداو؛ لەبەرکردنی نوێ پەیوەست بکە بە لەبەرکردنی وانەی ڕابردوو، لەسەر ئەمەش بەردەوامبە؟

چونکە زۆرێک لەو خۆشەویستانەی قورئانیان لەبەر کردوە، شەکوای حاڵی خۆیان دەکەن بەتایبەت لەسەرەتای ئایەتەکان و یاخود بەش و لاپەڕەکان، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ڕۆژانە لەبەرکردنی نوێیان نەبەستۆتەوە بەلەبەرکردنی ڕابردوو، کەواتە: لەکاتی لەبەرکردنی قورئاندا گرنگی بدە بەم ڕێگایە و کاری پێ بکە.

ئـەو کات بەپشـتیوانی خـوای پـەروەردگار بـۆت دەردەکەوێـت، بەچاکتریـن شـێوە ئایەتەکانـت لەبەرکـردون، ئەمـەش هانـت دەدا بـۆ لەبەرکردنـی هەمـوو قورئـان

## ٤ نهێنی چوارەم: پێداچوونەوە، پاشان پێداچوونەوە، پاشان پێداچوونەوە

دوای ئـەوەی ئـەو ڕێژەیـەی بڕیـارت لەسـەر دابـوو لـە قورئانـی پیرۆز لەبـەرت کردو بـەدەرخ بۆ مامۆسـتاکەتت خوێندەوە، بابەتێکی گرنگ دەمێنێتـەوە کە بەداخـەوە زۆربەی ئەوانەی قورئان لەبەردەکەن لەم بارەوە کـەم تەرخەمن، ئەویش بریتییە لـە: پێداچوونـەوە، پاشـان پێداچوونـەوە، پاشـان پێداچوونـەوە؟

چونکـە قورئانی پیرۆز جیاوازە لـە هەرجۆرە پەڕاوێکی تر، دوای ئـەوەی لەبـەری دەکەیت و پێداچونـەوەی پشـتگوێ دەخەیت؛ بێگومـان ئیدی بیـرت دەچێتـەوە.

پێغەمبـەر(ﷺ) لـەم بـارەوە هۆشـداری پێمانـداوە؟ چونکـە ئـەو ئێمـەی زۆر خۆشـدەوێت و بـە پەرۆشـە بۆمـان، وەک دەفەرمـوێ: [تَعَاهَـدُوا هَـذَا الْقُـرْآنَ، فَوَالَّـذِي نَفْـسُ مُحَمَّـدٍ بِيَـدِهِ لَهُـوَ أَشَـدُّ تَفَلُّـتاً مِـنَ الإِبِـلِ فِــي عُقُلِهَـا][1]، واتـە: پەیوەسـت بـن بـەم قورئانـە (جـار لـە دوای جـار بیخوێننـەوەو دەوری بکەنـەوەو بـەردەوام بـن)، سـوێند بـەو زاتـەی نەفسـی موحەممەدی(ﷺ) بەدەسـتە، ئـەو قورئانـە بـە خێراتر لەدەسـت دەردەچێـت لـە وشـتر لـە پەتەکـەی ملـی.

---

١ () أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٥٠٣٣، ومُسْلِم: ٧٩١. عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعري.

١

**پلانی پێداچوونەوەی ڕۆژانە**

ڕۆژانە دەوری یەک جوزە بکەرەوە
یەک جوزە= ٢٠ لاپەڕە

ئەو کەسەی کەمتر لە جوزئێکی لەبەرە، لەسەری پێویستە دەوری هەمووی بکاتەوە.

٢

**پلانی پێداچوونەوەی هەفتانە**

پێداچونەوەی ئەو بەشەی قورئان، کە لەماوەی هەفتەیەک دا لەبەرت کردوە، ئەمەش بەگوێرەی ئەو پلانەی لە خشتەی لاپەڕە (٦١-٦٢) دا خستومەتە ڕوو.

٣

**پلانی پێداچوونەوەی مانگانە**

پێداچونەوەی پێنج جوزە بەشێوەی مانگانە، ئەگەر تۆ کەمتر لە پێنج جوزئت لەبەرە.. ئەوە لەسەرت پێویستە لەماوەی مانگەکەدا دەوری هەمووی بکەیتەوە، ڕۆژێک یان دوان تەرخان بکە بۆ دەوری مانگانە، ئەمەش بەڕاستی زۆر گرنگە.

گومانی تێدا نیە جێبەجێ کردنی ئەم پلانانە وەهات لێ دەکەن، بەشێوەیەکی بەردەوام ژیانت لەگەڵ قورئاندا بێت و لەبیریشت ناچێتەوە؛ ئەم پلانانە کەمترین ئەندازەگیرین و بەڵام ئەوەی گرنگە بە بەردەوامی جێبەجێ کردنیانە، هەرگیز مەڵێ: دەورکردنەوەی پێنج جوزء مانگانە زۆر زۆرە؟ چونکە من کەسانێک دەناسم تەنها لەماوەی یەک ڕۆژدا پێنج جوزء دەور دەکەنەوە!!

## ٥ نهێنی پێنجەم: بەردەوام لەسەر یەک موصحەف قورئان لەبەر بکە

یەک لەو نهێنییە گرنگانەی پێویستە ڕەچاوی بکەیت، بریتییە لە لەبەرکردنی قورئان لەسەر یەک موصحەف، نەک ئەمڕۆ لەسەر «موصحەفێک» قورئان لەبەر بکەیت، ڕۆژی دواتر شێوەی چاپی موصحەفەکە بگۆڕیت؛ چونکە قورئانی پیرۆز جۆرەها چاپی جیاوازی هەیە.

لەوانەیە بتەوێ هۆکارەکەی بزانیت و بپرسیت: بۆچی لەسەر {یەک جۆر موصحەف} قورئان لەبەربکەم؟! ئایا هەموو چاپە جیاوازەکانی قورئان هەر هەمان ئایەتەکانی قورئانیان لەخۆیان نەگرتوە؟!

لەوەڵامدا دەڵێم: ئەو کەسەی قورئان لەبەر دەکات و لە کاتێکدا لەسەر یەک جۆر موصحەف قورئان دەخوێنێتەوە؛ شێوە و شوێنی ئایەتەکان لە مێشکی دا دەچەسپێت، شوێنی ئایەتەکانی بیر ناچێتەوە، بۆ نمونە: کاتێک ئایەتی (٣٠) سورەتی: {فُصِّلَتْ} دەخوێنێتەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ...﴾، لەمێشکیدا ئەوە دەچەسپێت، کە ئەم ئایەتە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی لاپەڕەی لای چەپەوە.

وەکاتێک ئایەتی (٦٨) سورەتی {الفُرْقَانِ} دەخوێنێتەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ...﴾، دەزانێت ئەم ئایەتە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی لاپەڕەی لای چەپەوە، هەروەها ئایەتی: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا﴿٣١﴾﴾، النَّبَإِ: ١، لەمێشکیدا ئەوە دەچەسپێت، کە ئەم ئایەتە لە سورەتی: {النَّبَإِ} دایە، لە بەشی سەرەوەی لاپەڕەی لای ڕاست دا.. بەو شێوازە وێنەی ئایەتەکان لە مێشکیدا بەگوێرەی شوێنەکانیان دەچەسپێت، ئەمەش بەپێی جۆری ئەو موصحەفەی ئایەتەکانی تیادا لەبەر کردوە.

**لە یەک موصحەفدا قورئان لەبەر بکە؛**

**چونکە چەندین چاپی جیاوازی قورئان هەیە کە شوێنی ئایەتەکان بەپێی چاپەکان دەگۆڕێت، بەم هۆکارەوە لەبەرکردنی قورئان لەسەرت قورس دەبێت و دواجار شوێنی ئایەتەکان تێکەڵ دەکەیت.**

ئامۆژگاریتان دەکەم بۆ لەبەرکردنی قورئان موصحەفی چاپی مەدینە بەکار بهێنن، کە لەلایەن کۆمەڵەی مەلیک فەهدەوە چاپ کراوە، گرنگی چاپی مەدینە لەوەدایە، کە هەموو لاپەڕەیەک بەئایەتێک دەست پێ دەکات و بەئایەتێکیش کۆتایی دێت، ئەمە لەکاتێکدایە چەندین چاپی تر بونیان هەیە، کە بەسەرەتای ئایەت دەست پێ ناکات و کۆتایی ئایەتێکیش ناکاتە کۆتایی لاپەڕەکە، هەروەها قورئانی پیرۆز {چاپی مەدینە} بەشێوازێک چاپ کراوە، هەموو جوزئێک لە بیست لاپەڕە پێکهاتووە، ئەمەش پلانی لەبەرکردنی قورئانت بۆ ئاسان دەکات.

## ٦ نهێنی شەشەم: کاتە ئاڵتونییەکان هەڵبژێرە

لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز پێویستی بەمێشکێکی ئاسودە و کەشێکی لەبار هەیە بۆ چەسپاندن و تەرکیز خستنە سەر ئایەتەکان لە یادەوەریدا، لەبەرئەوە بۆ لەبەرکردنی قورئان ئەو کاتانە دیاری بکە، کە زۆربەی کات ئاسودەکەری تۆن، لە نمونەی ئەو کاتە پیرۆزانەش دوای نوێژی بەیانییە، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿..وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا۝٧٨﴾ الإسراء:

٧٨. واتــە: بەڕاســتی قورئــان خوێندنــی نوێــژی بەیانــی، هەمیشــە دەبینرێــت {لەلایــەن فریشــتەکانی شــەو و ڕۆژەوە}.

هەروەهــا کاتــی عەســر لــە نمونــەی ئــەو کاتــە زۆر چاکانەیــە بــۆ لەبەرکردنــی قورئــان، بەتایبــەت ئەگــەر لەمزگــەوت دا بیــت هەســت بەئارامــی و دڵنیایــی زۆر دەکەیــت.

پێش نوستن لـەو کاتـە ئاڵتونییانـەی تره کە خەڵکی لێی بێ ئاگان، بەڵێ لەوانەیـە پێش نوسـتن کاتێکی گونجـاو نەبێت بـۆ لەبەرکـردن، بــەڵام کاتێکــی زۆر گونجــاوە بــۆ پێداچونــەوە و چەســپاندنی ئــەوەی لەبەرمــان کــردوە، یــەک لــە توێژینــەوەکان کەوتــە بەرچــاوم، دەڵێــت: کاتــی نوســتن یەکێکــە لــەو کاتــە گرنگانــەی کــە توانــای مێشــک بــۆ لەبەرکــردن زیاتــر دەبێــت.

## ٧ نهێنی حەوتەم: ئەوەی لەبەری دەکەیت بینوسەرەوە



دەفتەرێک بکرە و لەتەنیشت پشتییەکەت دایبنێ و لەکۆتایی ڕۆژەکەداو پێش ئەوەی بخەوی، ئەوەی لەماوەی ئەو ڕۆژەدا لەبەرت کردوە بینوسـەرەوە؟ چونکە لەلای هەندێک کەس نوسینەوەی ئایەتەکان کاریگەری گەورە دروست دەکەن لە چەسپاندنی ئەوەی لەبەری کردوەو، بیرخستنەوەیی و بەیەکەوە بەستنەوەی نێوانی ئایەتەکان.

گەشتم بۆ ژمارەیەک وڵات کردووە و سەردانی چەندین خولی لەبەرکردنی

قورئانم کردووە، بۆم دەرکەوتوە زۆرینەی ئەوانەی بەجوانی قورئانیان لەبەرکردووە، ئەو کەسانەن کە دواتر بڕی ئەو قورئانە دەنوسنەوە کە لەماوەی ئەو ڕۆژەدا لەبەریان کردوە، هەروەک نمونەی ئەمەشم لە وڵاتی مەغریب بینی..؛ چەندە جوانە کە پارێزگاری لەم دەفتەرە بکەیت تا ئەو کاتەی بەپشتیوانی خوا هەموو قورئان لەبەر دەکەیت، خۆشحاڵیت وێنا ناکرێت کاتێک دەبینی هەموو قورئانت بە دەست و پەنجەی خۆت نوسیوەتەوە، بەڕاستی هەستێکی زۆر جوان و دروستە.. گومانی تێدا نیە نوسینەوەی ئەو ئایەتانەی لەبەرت کردوون کاتێکی زۆرت لێ دەگرن، بەڵام لە ئەزمونمەوە ئەو ڕاستییە سەلمێنراوە کە ئەمە هەنگاوێکی پێویستە بۆ زیاتر چەسپاندنی ئەوەی کە لەبەرت کردووە.

## ٨ نهێنی هەشتەم: زۆر گوێ بگرە بۆ ئەوەی لەبەرت کردووە



لەو نهێنییانەی یارمەتیت دەدەن بۆ لەبەرکردنی قورئان بەشێوەیەکی وردوو شارەزا، گوێگرتنە لە قورئانخوێنێکی شارەزا و دەنگخۆش بەتایبەت گوێگرتن لەو قورئانخوێنانەی حەزت بەدەنگیان هەیە، چوونیەکە ئەو گوێگرتنە {ڕۆژانە بێت یاخود هەفتانە} لەڕێگەی گوێگرتن لێی دەوری ئەو جوزئە بکەرەوە کە لەبەرت کردوە، ئیدی

گوێگرتنەکەش لەڕێی هەر ئامێرێکەوە بێت یارمەتیدەرێکی چاکە، دوای ئەم گوێگرتنەش دەبینی بەجوانترین شێوە ئەو جوزئەت لەبەرکردووە و بەکەمترین ماندوو بون بیرت دەکەوێتەوە.

من هەموو قورئانم خەتم کرد بەدەم گوێگرتن بۆ دەنگی قورئان خوێن {سعد الغامدی}، بێگومان ئەمەش کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر ئاستی لەبەرکردنم، کەواتە: گوێگرتن بۆ قورئان لەڕێی دەنگی قورئانخوێنە شارەزاکانەوە بەیارمەتی خوای گەورە هاوکارێکی چاکە لەسەر چەسپاندنی ئەوەی لەبەرت کردوە بەشێوەیەکی ورد.

## ٩ نهێنی نۆیەم: پێشبڕکێ



لەو نهێنییە گرنگانەی هەندێک لێی بێئاگان: ئەنجامدانی پێشبڕکێیە بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، مەبەست لەمەش پێشبڕکێ کردنە لەگەڵ کەسە نزیکەکان {ئەوانەی لەگەڵتدا قورئان لەبەر دەکەن} بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بەئامانجی هاندان.

هەرکەسێکیش هاوڕێیەکی نیە، تا لەگەڵیدا قورئان لەبەر بکات، دەکرێ لەگەڵ هاوسەرەکەیدا و لەماڵەوە پێشبڕکێ بکات و؛ داوای لێ بکات لەگەڵیدا قورئان لەبەر بکات.

ئەوەی پێم خۆشە باسی بکەم، لەکاتی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزدا، من کێبەرکێم لەگەڵ براو هاوڕێی خۆشەویستی هەموان {شێخ محمد البراک} دەکرد، بەهۆکاری ئەوەی تەمەنمان لەیەکەوە نزیک بوو، بەڵام ئەو پێش من دەستی کرد بەلەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، لەکاتی پێشنوێژی کردنیدا گوێم بۆ دەگرت، ئەمە هاندەرم بوو تا کێبەرکێی لەگەڵدا بکەم، ئەو پێشەنگ و هاوڕێمە، داواکارم لەخوای گەورە بیپارێزێت و بەرەکەت بخاتە تەمەنیانەوە..

لەشێوەکانی تری کێبەرکێ: بەشداریکردنە لە پێشبڕکێ ناوخۆیی و هەرێمی و جیهانییەکانداو ئەمەش بایەخێکی گەورەی هەیە بۆ قوتابیانی قورئان و هەموو ئەو کەسانەی کە قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەن، من بەشداریم لە هەموو ئەو پێشبڕکێیانەدا کردوە کە بۆم هاتونەتە پێش، بێگومان ئەمەش هەلێک بووە بۆ پێداچونەوە و پێشبڕکێ کردن لەسەر کار و کردەوەی چاکە، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿..وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ٢٦﴾ المُطَفِّفين: ٢٦. واتە: بۆ ئەوە با پێشبڕکێ بکەن پێشبڕکێ کاران.

لە پۆلی چوارەمی سەرەتاییەوە بەشداریم کردووە لەپێشبڕکێی قوتابخانەکاندا، تا گەیشتومەتە پۆلی چوارەمی ئامادەیی، سوپاس بۆ خوا بەردەوام پلەی یەکەمم بەدەستهێناوە.

بەهەمانشێوە بەردەوام بەشداریم لە پێشبڕکێ نێودەوڵەتییەکاندا کردوەو تا سەرئەنجام لەسەر ئاستی جیهانی پلەی دووەمم بەدەست هێناوە.



## ١٠ نهێنی دەیەم: خوێندنەوەی خێرا

بۆ خوێندنەوەی قورئان سێ جۆر خوێندنەوەمان هەیە، واتە: {سێ خێرایی جیاوازی خوێندنەوە}

ئەوانیش: خوێندنەوەی هێواش ناودەبرێت بە {التحقيق}، خوێندنەوەی خێرا ناودەبرێت بە {الحدر}، وەخوێندنەوەی مام ناوەند کە دەکەوێتە نێوان هەردوکیان و ناودەبرێت بە {التدوير} بێگومان ئەمەش پێویستی بەلێزانین و ڕاهێنانی زمان هەیە، تا بەجوانی هەرسێ جۆر خوێندنەوەکە دەربخات، لەگەڵ جەختکردنەوە لەوەی پێویستە لە هەموو جۆرەکانی خوێندنەوەدا یاساکانی تەجوید بەتەواوی جێبەجێ بکرێن.

ئامۆژگاریت دەکەم لەگەڵ مامۆستاکەت خۆت فێری خوێندنەوەی خێرا {الحدر} بکەی؟ چونکە ئەمە خوێندنەوەیەکی ئاسان و خێرایە و هیچ زیانێک بەپیتەکان ناگەیەنێت، بەڵکو هەموو پیتەکان مافی خۆیان پێدەدرێت لە زەننە و جوڵە و درێژکردنەوەدا، ئەمەش بەتێپەڕبونێکی خێرا دەبێت بەسەر ئەم مەرجانەدا؟

چونکە خوێندنەوەی خێرا گەورەترین یارمەتیدەرە لەسەر لەبەرکردنی قورئان؛ بەتایبەت کاتێک ڕێژەی لەبەرکردن زیاد دەکەی، ئەمەش هێزی باوەڕ بەخۆبوون دەبەخشێتە کەسەکە و وەهای لێ دەکات متمانەی بە لەبیرنەچونەوەی ئەو ڕێژەیەی قورئان هەبێت کە لەبەری کردووەو، یارمەتیشی دەدات کە لە کەمترین کاتدا زۆرترین ئایەت دەور بکاتەوە.

## ١١ نهێنی یانزەیەم:
## تێگەیشتن لەواتای ئەو ئایەتانەی کە لەبەریان دەکەیت

لەو هۆکارانەی کە یارمەتیت دەدەن تا بەشێوەیەکی ورد قورئان لەبەربکەیت: تێگەیشتنە لەواتای ئایەتەکان، ئەمەش بەوە دەبێت کە تەفسیری ئایەتەکان بخوێنیتەوە، سوپاس بۆ خوا سەرچاوەی کتێبی تەفسیریش زۆر زۆرە، لەئێستاشدا دەستخستنی کتێبەکانی تەفسیر زۆر ئاسانکراوە و دەتوانیت لەڕێگەی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانەوە سود لە سەرچاوە جیاوازەکانی تەفسیر وەربگریت، هەرکەسیش لەبەرکردنی قورئانی بەتەفسیرەوە تاقی کردبێتەوە، دەزانێت بەم ڕێگایە زیاتر قورئانەکە لەدڵیدا دەچەسپێت بەبەراورد بەو کەسەی کە بەبێ تێگەیشتن قورئانی لەبەرکردوە.

لەبیرمە جارێکیان لەگەڵ باوکم داو لەنوێژی تەراویحدا دەوری قورئانم دەکردەوە، لەو کاتەدا هەڵەم کردوو باوکم «خوا لێی خۆش بێت» پێی گوتم: بۆچی تەفسیری ئایەتەکان ناخوێنیتەوە؟! چیرۆکەکانی قورئان هەموویان جوان و سەرنج ڕاکێشن، بۆ نمونە: چیرۆکی پێغەمبەر یوسف و موسا، هەروەها چیرۆکی پێغەمبەر ئیبراهیم لەگەڵ باوکیداو، نوح لەگەڵ کوڕەکەیدا...، تەنانەت ئەو ئایەتەم لەبیرە کە هەڵەم تێدا کرد، ئەویش ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝٤١﴾ هود: ٤١. باوکم پرسیاری لێ کردم: ئایا هیچ شتێک دەربارەی ئەم چیرۆکە دەزانی؟ لەوەڵامدا وتم: نەخێر، پێی وتم: بڕۆ تەفسیرەکەی بخوێنەرەوە، دوای خوێندنەوەی تەفسیرەکەی؛ ئیدی لە خوێندنەوەی ئەم ئایەتانەدا هەڵەم نەدەکرد.

## ١٢ نهێنی دوانزەیەم: بەخشوعەوە بڕۆرە خزمەت قورئان

لەو نهێنییانەی یارمەتیت دەدەن لەسەر لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، ئاستی ئامادەیی دڵە لەگەڵ ئەو ئایەتانەداو ملکەچی نواندن و خشوعە لەگەڵیانداو، هەستکردنە بەگەورەیی واتای پەیامەکەی خوای پەروەردگار وەک دەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴿٢١﴾﴾ الحشر: ٢١. واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە بۆ سەر کێوێک {تێبگەشتایە لەوەی تیایدا هاتوە} دەتبینی بەملکەچی و لەت لەت بوونی لەترسی خوا، ئەم جۆرە نموونانە دەیان هێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە.

هەروەها خوای گەورە وەسفی باوەڕداران دەکات لەو کاتانەی قورئان دەخوێننەوە، وەک دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴿٢﴾﴾ الأنفال: ٢. واتە: بێگومان بڕواداران تەنها کەسانێکن کاتێک، باسی خوا کرا و ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و ترسی لێ دەنیشێت، کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان {پێی} زیاد دەبێت، هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن.

وە لە کاتێکدا جبریل قورئانی بۆ پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) خوێندوەتەوە، ئەو خۆشەویستە(ﷺ) بەئامادەیی دڵ و بەخشوع و ملکەچی تەواوەوە گوێی بۆ گرتوە، خوای گەورە لە سورەتی {الشُّعَرَاءِ} دا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ﴿١٩٤﴾﴾ الشُّعَرَاءِ: ١٩٢- ١٩٤. واتە: بەڕاستی ئەم {قورئانە} دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە،

جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ، تا ببیتە یەکێک لە ترسێنەران و خەڵکی پێ بترسێنیت.

ئەگەر دەتەوێ قورئان لەبەر بکەیت، ئەوا خشوع و ملکەچی بنوێنە لە خزمەتیداو، بەردەوام ئەو هەستەت هەبێت کە ئەم قورئانەی لەبەری دەکەیت وتەو فەرمایشتی خوای گەورەیە.



## ١٣ نهێنی سیانزەیەم: خوێندنەوەی قورئان لە شەونوێژدا

پەرۆشبە بۆ خوێندنەوەی ئەوەی لەبەرت کردوە لە نوێژە سوننەتەکان و بەتایبەت لە {شەونوێژدا}؟ چونکە شەونوێژ بۆ ئەو کەسەی قورئانی لەبەرە پێویستە و نابێت بەهیچ شێوەیەک لێی داببڕێت، بەهۆیەوە پێداچونەوەی ئەو بەشەی قورئان دەکات کەلەبەری کردوە و زیاتریش لەسەری دامەزراو دەبێت؛ بێگومان ئەو کەسەی قورئانی لە سینەیدا پاراستووە لەو کاتانەدا دەناسرێتەوە کە زۆرینەی خەڵکی نوستوون؛ دەی کەواتە هەستە بۆ ئەنجامدانی شەونوێژ تەنانەت ئەگەر لە دوو ڕکاتدا دەوری چەند ئایەتێک لەو ئایەتانە بکەیتەوە کە لەبەرت کردون؛ چونکە

بەو هۆیەوە چێژێکی گەورە دەبینی لەگەڵ ئەم قورئانەدا کە موعجیزەی خوایەو، زیاتریش لە دڵ و دەرونتدا دەچەسپێتو، لە لەبیرچونەوەی ڕزگارت دەبێت؛ بێگومان شەونوێژ سیفەتێکی بەردەوامی پیاوچاکان بوە وەک خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿كَانُواْ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ﴾ الذّاريَـات:١٧. واتە: ئەوانە کەمێک لە شەودا دەخەوتن «زۆرینەی شەوەکەیان تەرخان دەکرد بۆ شەونوێژو بەندایەتی».

لە ڕاستیدا لەبەرکردنی قورئانیش پێویستی دووبارە کردنەوە و پێداچونەوە هەیەو، هیچ بەندایەتییەک نیە گەورەتر و چاکتر بێت لە شەونوێژ؟ چونکە بەهۆیەوە چاودێری و پاراستنی خوایی بۆ خۆت دەستەبەر دەکەیت، ئەگەریش بەخشوعەوە قورئانت لەبەر کرد، ئەوە زیاتر لە ناختدا دەچەسپێت.

## سیانزە نهێنییەکە...

١ نهێنی یەکەم: دوبارەکردنەوە ڕێگای شارەزابونە

٢ نهێنی دووەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بەگوێرەی واتاکانیان

٣ نهێنی سێیەم: لەبەرکردنی نوێ بەلەبەرکردنی ڕابردوو ببەستەوە.

٤ نهێنی چوارەم: پێداچوونەوە، پاشان پێداچوونەوە، پاشان پێداچوونەوە.

٥ نهێنی پێنجەم: بەردەوام لەسەر یەک موصحەف قورئان لەبەر بکە:

٦ نهێنی شەشەم: کاتە ئاڵتونییەکان هەڵبژێرە

٧ نهێنی حەوتەم: ئەوەی لەبەری دەکەیت بینوسەرەوە

٨ نهێنی هەشتەم: زۆر گوێ بگرە بۆ ئەوەی لەبەرت کردوە.

٩ نهێنی نۆیەم: پێشبڕکێ

١٠ نهێنی دەیەم: خوێندنەوەی خێرا.

١١ نهێنی یانزەیەم: تێگەیشتن لەواتای ئەو ئایەتانەی کە لەبەریان دەکەیت

١٢ نهێنی دوانزەیەم: بەخشوعەوە بڕۆە خزمەت قورئان

١٣ نهێنی سیانزەیەم: خوێندنەوەی قورئان لە شەونوێژدا

خــوا لێــی ڕازی بــێ، کــە گوتوویەتــی: پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێک قورئان بخوێنێ و فێریبێ و کاری پێ بکات، لە ڕۆژی قیامەت دا، تاجێکی نوورینی لەسەر دەنرێ، کە تیشکەکەی وەک تیشکی خۆرە، وە دایک و بابیی دەڕازێنرێنەوەو خشڵیان لەسەر دەنرێ، کە لە دنیادا پێی هەڵنەستاون، دەڵێن: ئەوە بەچی ڕازێنراینەوە؟ پێیان دەگوترێ: بە هۆی دەستگرتنی منداڵەکەتان بە قورئانەوە.

**ئایا تائێستا دوودڵی!!**

**هەرئێستا ناوی منداڵەکەت بۆ لەبەرکردنی قورئان تۆمار بکە**



# چەند کلیلێکی یارمەتیدەری منداڵان تا بەشێوەیەکی ئاسان قورئان لەبەر بکەن

## ١ کلیلی یەکەم: مامۆستایەکی شارەزا و دەستپاک بۆ منداڵەکەت دیاری بکە

لە ئەرکە گرنگەکانی سەرشانی تۆ وەک سەرپەرشتیکاری منداڵ.. دەستنیشانکردنی مامۆستایەکی قورئانە بۆ منداڵەکەت، کە بێتە ماڵەوە یاخود منداڵەکەت بچێتە خزمەتی تا قورئانی پێ لەبەر بکات، لە گرنگترین ئەو مەرجانەی پێویستە لەو مامۆستایەدا بوونی هەبێت، دەبێت مامۆستاکە بەوردی شارەزای قورئانی پیرۆز بێت و، خاوەن ئەزمون و توانایەکی گەورە بێت لەچۆنییەتی فێرکردنی قورئان بە منداڵەکەت، هەروەها پێویستە ئەو مامۆستایە خاوەن خووڕەوشتی بەرزو پەسەند بێت؟ چونکە خوڕەوشت و شێوازی هەڵسوکەوتی ئەو مامۆستایە لە مێشکی منداڵەکەتدا دەچەسپێت.

لەوانەیە هەندێک پرسیار بکەن و بڵێن: مامۆستا بۆچی؟! بۆ منداڵەکەم هەرخۆی قورئان لەبەر نەکات؟!

لەوەڵامدا دەڵێم من لەگەڵ ئەوەی قورئانی پیرۆزم لەبەرە، بەڵام ناتوانم قورئان بەسالمی کوڕم لەبەربکەم، ناتوانم بۆ کچەکەم ببمە مامۆستای لەبەرکردنی قورئان؟ چونکە جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ڕێزگرتنی منداڵ بۆ باوکی، لەگەڵ ڕێزگرتنی لەو مامۆستایەی کە قورئانی پێ دەڵێت، بێگومان ئەمەش پەروەردەیەکی گەورەیە لە دەروونی منداڵاندا.

## ٢ کلیلی دووەم: هاندان و وریا کردنەوە

کاتێک کوڕەکەت یان کچەکەت دەستی کرد بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، ئەوە تامەزرۆی ئەوەبە کە بەشێوەیەکی بەردەوام هانیان بدەیت، لەگەڵ منداڵەکەت دابنیشە و قسەی لەگەڵدا بکەو پێی بڵێ: کوڕەکەم {کچەکەم} بەهۆکاری لەبەرکردنی قورئان لەلایەن ئێوەوە لەڕۆژی دوایی داو لە بەهەشتدا تاجی شکۆو ڕێزم لەسەر دەنرێت.

بەردەوام لەگەڵ کوڕەکەتدا گفتوگۆ بکەو تێی بگەیەنە، چۆن خوای گەورە بەهۆی قورئانەوە ڕێزی لێ دەنێت و سەرکەوتوی دەکات و یارمەتی دەدات، ئاواتی هەرشتێک بخوازیت خوای گەورە پێی دەبەخشێت؟! بەکچەکەشت بڵێ: کچی شیرینم ئەگەر قورئانت لەبەرکرد، ئەوە بەو هۆکارەوە خوای گەورە جیات دەکاتەوە و هەڵت دەبژێرێت بەسەر هەموو ئافرەتانی دونیادا، لە هەموو خراپەیەکیش دەتپارێزێت.

چەند دیارییەکی بەنرخ بۆ منداڵەکانت دابین بکە، دیارییەک لەلایان تایبەت و خۆشەویست بێت، بەشێوەیەکی زیرەکانە پاداشتیان بکە، لەو چیرۆکە سەرنجڕاکێشانەی یەکێک لە هاوڕێکانم بۆی گێڕامەوە و وتی: باوکم نیوەی سامانەکەی خۆی پێ بەخشیم ئەمەش وەک هاندان و پشتیوانی ئەو تا لەسەر لەبەرکردنی قورئان بەردەوام بم، لەبەرانبەر لەبەرکردنی هەر سورەتێکی قورئاندا «بڕێک پارەی» دیاری کردبوو، کە وەک پاداشت و هەڵنان پێمی بدات.



## ٣ کلیلی سێیەم: بەتەنها خوێندنەوە و دەورکردنەوەی ئایەتەکان بەس نیە، بەڵکو پەروەشی ئەوەبن منداڵەکانتان داواکاری ئایەتەکان بەکردەوە جێبەجێ بکەن

لە ئەرکەکانی دایکان و باوکان تامەزرۆییانە بۆ چاودێریکردنی منداڵەکانیان لەدوای کۆتایی هاتنی وانەکانیان و گەڕانەوەیان لەلای مامۆستاکەیان، پێویستە دایکان و باوکان ئاگاداری ڕێژەی ئەو ئایەتانە بن کە لەوانەی نوێدا خوێندویانە، هەروەها کورتکردنەوەی ئەو ئاکار و خوڕەوشتانەی کە هەڵهێنجراوی ئایەتەکانی قورئانن، زۆر گرنگە دایکان و باوکان هەوڵ بدەن لە منداڵەکانیاندا جێبەجێیان بکەن، بەردەوام منداڵەکانیان ئاگاداربکەنەوە، تا بەباشترین شێوە ڕێزی مامۆستاکانیان بگرن؟ چونکە مامۆستا وەک باوکی دووەمتان وەهایە و ئەوە کە قورئانی پێ لەبەرکردوون.

بێگومان ئێمە نەوەیەکمان ناوێت، تەنها کاری بریتی بێت لە خوێندنەوە و دەورکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان بەبێ تێگەیشتن و جێبەجێ کردنی ئەوەی تیایدایە لە یاسا و خوڕەوشتە بەرزو پەسەندەکان، تامەزرۆبە تا مامۆستاکەشی لەم بارەوە ئاگاداری بکاتەوە و لەکاتی لەبەرکردنی ئایەتەکاندا هەندێک وشەی بۆ دیاری بکات و، واتای ئایەتەکانی فێر بکات و پەیوەستیان بکاتەوە بەژیانی ڕۆژانەی منداڵەکەوە، هەروەها خوڕەوشتەکانی پێغەمبەری خواشی(ﷺ) فێر بکات.



**ئێمە نەوەیەکمان ناوێت، تەنها کاری خوێندنەوە و دەورکردنەوەی ئایەتەکان بێت بەبێ تێگەیشتن و جێبەجێ کردنی ئەوەی لە قورئاندایە لە یاسا و خوڕەوشتە بەرزو پەسەندەکان.**

٤

## کلیلی چوارەم:
## زۆر لە منداڵەکەت مەکە بۆ لەبەرکردنی قورئان

لەو ڕاستییانەی کە پێویستە ئاگاداریان بین: ئەگەر تۆ بەڕاستی تامەزرۆی ئەوەی منداڵەکەت قورئان لەبەر بکات و، لەسەری بەردەوام بێت.. ئەوە هەوڵ بدە زۆر لە منداڵەکەت نەکەیت و فشاری زۆری نەخەیتە سەر تا قورئان لەبەر بکات، ئەمەش لەپێناو ئەوەدایە ئەنجامەکەی پێچەوانە نەبێتەوە؟

چونکە من خەڵکانێکی زۆر دەناسم کوڕەکەی بەزۆر ناچار کردبوو، تا قورئانی پێ لەبەر بکات، تەنانەت بێبەشی کردبوو لەتێکەڵاوی کردنی خەڵکی، دابڕی بوو لە هاوڕێکانی، بەشێوەیەکی ئەوتۆ ڕەفتاری لەگەڵ دەکرد وەک ئەوەی ئەم کوڕەی ئەو جیاواز بێت لە خەڵکی ترو مرۆڤێکی داخراو بێت!! بێگومان ئەمەش هەڵەیە.. ئەگەر تێبینی ئەوەت کرد منداڵەکەت بەمە بێزار دەبێت؛ لەسەرت پێویستە وازی لێ بهێنیت و دەست لەم شێوازی مامەڵە کردنە هەڵبگریت، لەبری ئەم بێزارکردنە هەوڵبدە قورئانی لەلا خۆشەویست بکەی، لەڕێی ئامێرە ئەلکترۆنییە جیاوازەکانەوە قورئانی بۆ بخەرە سەرو، جاروبار ئامێرە ئەلکترۆنییەکانی بۆ بگۆڕە، ئامێرێکی نوێی بەدیاری پێشکەش بکە، تا لەم ڕێگەوە قورئان لەلای خۆشەویستر ببێت.. وریابەو خۆت بپارێزە لە بەکارهێنانی توندوتیژی، تا نەبێتە هۆکاری ئەوەی منداڵەکەت بەدرێژایی تەمەنی کەسێکی ڕاکردووبێت لە قورئان.

کەواتە: لەپێناو ئەوەی منداڵەکەت بەدرێژایی تەمەنی لەقورئان ڕانەکات، وریابە و خۆت لەبەکارهێنانی توندوتیژی بپارێزە.



**بۆ لەبەرکردنی قورئان زۆر لەمنداڵەکەت مەکە،**
**هەتا ئەنجامەکە پێچەوانە نەبێتەوە.**

## ٥ کلیلی پێنجەم: خشتەی لەبەرکردنی قورئان

دوای سەرکەوتنت لەپەیداکردنی مامۆستایەکی شارەزا بۆ منداڵەکانت، کارێکی نایابە ئەگەر مامۆستاکەی خشتەیەک دابنێت و ناوی منداڵەکانی تیادا تۆمار بکات و، بەشێوەیەکی رۆژانە رێژەی ئەو ئایەتانەی لەلایەن قوتابییەکەوە لەبەر دەکرێت لەبەرانبەر ناوەکەی دا تۆماری بکات، هەروەها لە خشتەکەدا مامۆستا ئاست و توانای قوتابییەکە هەڵسەنگێنێت و، لەکۆتایی خشتەکەشدا خانەیەک تایبەت بکات بەواژۆی سەرپەرشتیکاری قوتابییەکەوە، تۆش لەرێگەی ئەم خشتەیەوە دەتوانی بەدواداچون بۆ ئەندازەی ئەو ئایەتانە بکەیت کە منداڵەکەت لەبەری کردوە و هەروەها لەم رێگەوە ئاستەکەشی دەزانیت، دەتوانی ئەم خشتەیە بکەیتە هۆکارێک بۆ بەهێزکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی منداڵەکەت، وەدەتوانی پاداشتی بکەی ئەگەر بەچاکی وانەی رۆژانەی لەبەر کرد، ئەمەشم وەک {ئەزموونی من} تاقی کردوەتەوە و سودم لێی بینیوەو بەهۆکارێکی سەرکەوتوی دەزانم.

**لەکۆتایی ئەم کتێبەدا و لە بەشی خشتەکاندا، خشتەیەکم بۆ ئامادە کردون کە سودی زۆری لێ دەبینن لەچۆنییەتی بەدواداچونی ئاستی منداڵەکانتان، دەتوانن وێنەی بگرن و کۆپی بکەن، خشتەکەش لە لاپەڕە (١٧٧) دایە.**

## ٦ کلیلی شەشەم: دوعاکردن بۆ منداڵەکانمان

دوعـاو پاڕانـەوە تیریکـە ئامانجـی خـۆی پێکاوەو بەیەقینـەوە لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە وەڵام دەدرێتەوە.. بۆچـی!! چونکە ئـەم دوعایـە لەلایـەن دایـک و باوکەوەیـە بـۆ منداڵەکانیـان، ئـەم فەرمـوودە سەرسـوڕهێنەرە بخوێننـەوە: {عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللــهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُــوْلُ اللهِ (ﷺ): «ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ لا تُــرَدُّ: دَعْوَةُ الْوَالِــدِ، وَدَعْوَةُ الصَّائِمِ، وَدَعْــوَةُ الْمُسَــافِرِ»}[1]، واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیک (خـوا لێی ڕازی بـێ)، دەڵێ: پێغەمبـەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: سـێ دوعاو پاڕانەوە هـەن ڕەت ناکرێنەو: دووعای دایک وبـاب، وە دووعای ڕۆژووەوان، وە دووعـای گەشـتیارو ڕێبوار.

ڕۆژێـک لـە مزگەوتەکەمـدا لە وڵاتـی کوەیت پێشـنوێژیم دەکرد «زۆربـەی کات ئەگـەر لەخوێندنـەوەی سـورەتە درێژەکانـدا هەڵـە بکـەم پیاوێکـی بەتەمـەن هەیـەو بـەردەوام هەڵەکانـم بـۆ ڕاسـت دەکاتـەوە» دوای ئـەوەی لەنوێـژ بوینـەوە، چومـە خزمەتـی و پرسـیاری ئـەوەم لـێ کرد: ئایـا هەمـوو قورئانی پیـرۆزت لەبەرە؟ دوای وەڵامدانەوەکـەی، دووچـاری سەرسـوڕمان بـووم؟ چونکـە ئـەم وەڵامـە بۆ مـن شـتێکی زۆر سـەرنج ڕاکێش بـوو، فەرمووی: {لەتەمەنی شەسـت سـاڵیدا هەموو قورئانم لەبەر کرد!؟ بیرمە کاتێک منـداڵ بـووم، دایکم بـەردەوام لەخـوا دەپاڕایەوە، کە سـەرکەوتوم بـکات تـا هەمـوو قورئان لەبـەر بکەم... تـا کۆچی دوایی کـرد ئەمە دوعـای بەردەوامـی دایکم بـوو..! دوای ئەم هەمـوو تەمەنەم خوای پـەروەردگار سـەرکەوتوی کردم لەگەڵ بانگ بێـژی مزگەوتەکەماندا

١ ) أخرجهُ البَيْهَقيُّ في (الكُبرى): (٦١٨٥)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٧٩٧).

هەمــوو قورئانــم لەبەر كــرد، دواجار خــوای گەورە وەڵامی دوعاكــەی دایكمــی دایەوە}.

لێــرەوە دەمــەوێ بەدایــكان و باوكانــی خۆشەویســت ڕابگەیەنــم: كــە یەكــەم ڕێگا و كۆتــا ڕێــگای لەبەركردنــی قورئــان لەلایەن منداڵەكانتانــەوە بریتییە لە دوعــاو پاڕانەوە، بــەردەوام دوعایــان بــۆ بكــەن لەكاتــی ســوجدە بــردن و لەنــاو نوێژەكانتانــدا، بــا هەمــوو كات دەســتەكانتان بــەرەو ئاســمان بەرزكراوەبــن و داوا لەخوای گەورە بكــەن هیواكانتــان بــەدی بهێنێــت، منداڵەكانتان بەچاكترین شــێوە قورئــان لەبــەر بكــەن و لەخوڕەوشــتییاندا ڕەنــگ بداتــەوە و خۆیانی پێ برازێننــەوە.



لەبەندی پێشودا گفتوگۆمان کرد دەربارەی ڕێگاکانی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، هەروەها باسی ئەو نهێنییانەمان کرد، کە بەپشتیوانی خوای گەورە هاوکار دەبن بۆ شارەزابونی منداڵەکانمان لە قورئان و خۆشەویستکردنی قورئان لەدڵی منداڵەکانمانداو لەبەرکردنی ئایەتەکانی بەچاکترین شێواز، بەڵام لەم بەندەدا باسی ڕامان لە قورئان دەکەین و، ئاماژە بەوە دەکەین کە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بەبێ تێڕامان و تێگەیشتن لەواتاکەی سودی نیە، هەر لەم بەندەدا باسی گرنگی ڕامان لەقورئان دەکەین، ئاماژە بەو هۆکارانەش دەدەین کە یارمەتیمان دەدەن بۆ ڕامان و وردبوونەوەمان لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو، ئاشناتان دەکەین بەگرنگترین بەروبومی ڕامان لە قورئان، باسی ئەو ڕێگرییانەش دەکەین بەربەستن بۆ ڕامان و ووردبونەوەمان لەقورئانی پیرۆز، داواکارم لەخوای پەروەردگار قورئان بکاتە بەهاری دڵەکانمان و نوری سینەمان، لابەری خەم و پەژارەکانمان بێت، یارمەتیدەرمان بێت بۆ تێڕامان لە قورئانی پیرۆز و تێگەیشتن لە واتاکەیی و کارکردن بەقورئان.

## بەگەورەگرتنی قورئان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە

پێش ڕامان و وردبونەوەمان لە قورئانی پیرۆز لەسەرمان پێویستە ئەم پەڕاوە بەگەورە و پیرۆز ڕابگرین، کاتێکیش بۆمان دەرکەوت کە خوای پەروەردگار بەگەورەیی و شکۆ و هێزی خۆی قورئان بەگەورە ڕادەگرێت، ئیتر لەو ڕاستییە تێدەگەین کە پێویستە ئێمەی موسڵمانیش قورئان بەگەورە و پیرۆز ڕابگرین، لەکاتی خوێندنەوەی قورئانیشدا دەگەین بەزۆرێک لەو ئایەتانەی کە خوای پەروەردگار بەگەورە ڕادەگرن، لە نمونەی ئەو ئایەتانەش، وەک:




لە شاری مەدینە چاوم کەوت بە بەڕێز {شێخ صالح بن عواد المغامسي}، دەربارەی بە گەورەگرتنی قورئان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە پێی وتم:

بێگومان بەگەورەگرتنی قورئانی پیرۆز لە زۆرێک لە ئایەتەکانی قورئاندا باسکراوە، هەروەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ..﴾ الحَشر: ٢١.

لەم ئایەتەدا دوو دەستە واتە دوو گروپ بونیان هەیە، ئەوانیش، شاخێکی کەڕو، مرۆڤە لارو لاسارەکانی ناو گرۆهی ئادەمن، جیاوازی نێوان ئەم دووانەش ئەوەیە، خوای گەورە نمونەی بەشاخێکی کەڕ هێناوەتەوە و هەواڵمان دەداتێ بەوەی ئەگەر گریمان ئەم قورئانەمان دابەزاندایە بۆ سەرشاخێکی کەڕ، دەرکی کردبا بەوەی لەناو ئەم قورئانەدایە، ئەوە دەتبینی کە پارچە پارچە دەبوو لەترسی خوا و بەڵێنەکانی خوا، دواتر نمونە بەلار و لاسارەکانی ناو گرۆهی ئادەم دەهێنێتەوە، کە دڵیان زۆر ڕەقترە لە بەرد و شاخێکی کەڕ، بەهیچ شێوەیەک لە ئاست بەڵێنەکانی خوادا ملکەچ نابن و ترس دایان ناگرێت.

هەروەها خوای پەروەردگار لە ئایەتی {٣١} سورەتی {الرَّعد} دا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ..﴾

وەڵامەکە لەناو ئایەتەکەدا نەهاتوە و بەڵکو خودی ئایەتەکە ئاماژەیە بۆ واتاکەیی و دەفەرموێت: ئەگەر کتێبێک هەبوایە شاخەکانی پێ بەڕێ بکردرایە، یاخود زەوی پێ پارە پارە بکرایە، یاخود مردووەکانی بهێنایەتە قسە، ئەوە ئەو کاتە ئەم قورئانە خودی ئەو کتێبە دەبوو.




{شێخ صالح المغامسي} لە درێژەی وەڵامەکەیدا دەڵێت: {خوای پەروەردگار قورئانی بەگەورە ڕاگرتووە لەپێناو ئەوەی مرۆڤەکان زیاتر بەگەورە ڕایبگرن، تا موسڵمانان و باوەڕداران زیاترو زیاتر بەگەورە و پیرۆزی ڕابگرن، وە قورئان گەورەترین شانازی فریشتە جبریلە؟ چونکە خوای پەروەردگار بەو فریشتەیەدا قورئانی دابەزاندووەتە سەرزەوی، هەر لەبەرئەوەیە خوای پەروەردگار بەهۆکاری گەورەیی قورئانەوە

جبریلی گەورە و پایەدار کردووە، کە لەڕێگەی ئەوەوە دابەزێنراوە بۆ سەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لەبەرئەوە کاتێک تاقمێک لە جولەکە دەربارەی جبریل قسەیان کرد، هەر بەفریشتە جبریلدا خوای گەورە چەندین ئایەتی قورئانی دابەزاند، کە هەمووی بریتی بوو لە بەرگری و سەرخستنی جبریل و شایەتیدانی خوای پەروەردگار بۆ ڕاستگۆیی و پایەبەرزی ئەو فریشتە بەڕێزە، هەروەک خوای گەورە لە ئایەتی (٩٧) ی سورەتی {البَقَرَةِ} دا دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾﴾، سەرئەنجام خوای گەورە ئەم ئایەتەی کردە یەکێک لە هۆکارەکانی گەورەیی جبریل و بەرزی پێگەکەیی و دەفەرموێ: هەرکەسێک دوژمنایەتی جبریل بکات، ئەوە دژایەتی خوای پەروەردگاری کردوە.



بێگومان قورئان سەرچاوەی ژیانە، سەرچاوەی سەرەکی وەرگرتنی ئیمەیەو، بۆ ناسینی خوای گەورە بەردەوام زانیاری لەم قورئانەوە وەردەگرین و، تاکە ڕێگای گەیشتنمان بەم ڕاستییە تەنهاو تەنها قورئانە، کاتێک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۗ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾ طه: ١١٤. هەندێک لە پێشینان دەربارەی {وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا} دەفەرموون: واتە ئەی پەروەردگارم زانست و زانیاریم زیاد بکە بەقورئان و واتاکانی قورئان، دوای قورئان خەڵکی پێویستییان بەشارەزابون هەیە لەسوننەتی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)... کۆتایی وتەکانی شێخ صالح المغامسی.

## بەگەورەگرتنی قورئان لەلایەن پێغەمبەری خواوە(ﷺ)

وەرن لەگەڵم دا با بەیەکەوە وردببینەوە لەشێوازی هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا.. با بزانین پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە چ شێوازێک قورئانی بەگەورە ڕاگرتوە، هەموو ئەو کەسانەشی بەگەورە ڕاگرتووە، کە قورئانیان لەبەرکردووە.

پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بەدرێژایی شەوێک شەونوێژ تەنها ئایەتێکی قورئانی دووبارە کردوەتەوەو، هێندە بەپێوە وەستاوە هەتا پاژنەی پێیەکانی قڵیشیان بردوە، زۆرجار دەیفەرموو: «شيبتني هود وأخواتها». واتە: سورەتی هود و دەستە خوشکەکانی پیریان کردم. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئایەتانەی کە لەو سورەتانەدا هاتون و، گەورەیی و کاریگەری ئایەتەکان خەریک بوو شاخەکانی هەپرون هەپرون دەکردو، چەندین بەڵێنی خوای پەروەردگاریش لەو ئایەتانەدا بونی هەیە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) تا لەژیاندا بوو ڕێگری لەهاوەڵەکانی دەکرد، کە فەرمودەکانی و سوننەتەکانی بنوسنەوە، ئەمەش لەپێناو ئەوەدا بوو هەتا خەڵکی لەو بارەوە دوچاری سەرلێشێوان نەبن، ئایەتەکانی قورئان تێکەڵ نەکەن لەگەڵ فەرمودەکانی خۆی دا، هۆکاری ئەمەش ئەو هەموو ڕێز و بەگەورەزانینەی قورئان بوو لەلایەن پێغەمبەری ئازیزەوە(ﷺ).

هەر لەبەرئەوە کاتێک جبریل ئایەتەکانی دادەبەزاندە سەر دڵی خاوێنی، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر پەرۆش و بەهەوڵ بوو بۆ وەرگرتنی قورئان لە دەمی جبریلەوە و بەردەوام لەگەڵ جبریلدا ئایەتەکانی

دوبارە دەکردنەوە؟ چونکە نوری چاومان(ﷺ) زۆر پەرۆشی لەبەرکردنی ئایەتەکان بوو، بەردەوام ترسی لەبیرچونەوەی هەبوو، تا سەرئەنجام پەروەردگار ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاند کە دەفەرموێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾﴾ القيامة: ١٦ – ١٧. واتە: زمانت مەجولێنە {بەخوێندنەوەی قورئان لە کاتی دابەزینی وەحیدا} تا پەلەی تیا بکەیت، بەڕاستی {وەک بەڵێنمانداوە} بێگومان لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لە سنگتدا و خوێندنەوەی.

پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بەردەوام پێگەی ئەو کەسانەی بەرز دەکردەوە کە قورئانیان لەبەربوە، تەنانەت لە جەنگی ئوحود دا کاتێک زۆرێک لەو هاوەڵانە شەهیدبوون کە قورئانیان لەبەربوو، وەک ڕێزلێنانیان بەخاکسپاردنی ئەمانی پێش خست بەسەر شەهیدانی تری ئوحود دا.

لە کۆڕو کۆبونەوەو کاتی جەنگەکاندا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی دەکرد بەپێشخستنی هەموو ئەو کەسانەی کە قورئانیان لەبەرە، ئەو بەو شێوازە قورئانی بەگەورە ڕاگرتوەو، لەسەر ئێمەش پێویستە ئەم قورئانە بەگەورەو پیرۆز ڕابگرین؟ چونکە قورئان چاکترینی ووتەکانەو فەرمایشتی خوای گەورەیە.

## بەگەورە گرتنی قورئان لەلایەن هاوەڵانەوە

خالیدی کوڕی وەلید بەردەوام دەیفەرموو: جیهادو تێکۆشان ڕێگرم بوون بۆ زیاتر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز؟!.

سەرقاڵبونی خالیدی کوڕی وەلید بەجیهاد و هەوڵ و تێکۆشانەوە، کە چڵەپۆپەی هەرەبەرزی ئەم ئیسلامەیەو گەورەترین کارو کردەوەیە لەلای خوای گەورە، وای لێکردبوو زۆر نەیپەرژێتە سەر خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، واتە: خۆشەویستی دونیا

و ماڵ و منداڵ و خۆشییەکانی ئەم دونیا کاتییە نەبوون، کە خالیدی کوڕی وەلید یان دابڕی بوو لە خوێندنەوەی قورئان و لەبەرکردنی.

ئیبن عومەر لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا لەگەڵ هیچ کەسێکدا قسەی نەدەکرد و ئاوڕی نەدەدایەوە، هەتا لە خوێندنەوەی ئایەتەکان دەبویەوە، دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)، ئەبوبەکری صدیق فەرمانی بە زەیدی کوڕی سابت کرد کە قورئان کۆبکاتەوە و لەیەک پەڕاودا بینوسێتەوە، زەید لەو کاتەدا فەرمووی: {سوێند بەخوا ئەگەر داوام لێکرابایە شاخێک بگوازمەوە، ئەمەم زۆر لەلا ئاسانتربوو لەوەی قورئان کۆبکەمەوە}؟!. فەرمایشتەکەی دەرخەری ئەو ڕاستییەیە بەوەی ئەو چەندە قورئان بەگەورە ڕادەگرێت.

ڕەوشتی بەرزی هاوەڵان لەخزمەت قورئاندا ئەوەبوو کە دە ئایەتیان لەبەردەکرد، پاشان بەشێوەیەکی زۆر ورد لەواتای ئایەتەکان ڕادەمان و لە خزمەتیاندا دەبون و دڵیان بۆ واتای ئایەتەکان ڕام دەبوو، دواتر بەکردەوە داواکاری ئەو دە ئایەتەیان جێبەجێ دەکرد، ئینجا دەچونە خزمەت دە ئایەتی تر و لە واتاکانیان ڕادەمان و لە ژیانی ڕۆژانەیاندا داواکاری ئایەتەکانیان جێبەجێ دەکردن و... هاوەڵان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەو شێوازە قورئانیان بەگەورەو پیرۆز ڕاگرتوە.

## پەیوەندی دڵ لەگەڵ قورئانی پیرۆز

لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا: ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾﴾ الشُّعَرَاء:١٩٣ – ١٩٤. دەربارەی پەیوەندی دڵ لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، پرسیارم لە بەڕێز {شێخ صالح بن عواد المغامسي} کرد، لە وەڵامدا فەرمووی: دڵ بریتییە لە وەرگری یەکەم

و خەڵکیش لە قورئاندا گفتوگۆیان لەگەڵدا نەکراوە بەشتێک، کە گەورەتر و پیرۆزتر بێت لە گفتوگۆ کردن لەگەڵ دڵەکانیاندا، ئەمە گەورەترین ئامانج و مەبەستی قورئانی پیرۆزە، پێویستە ئەهلی عیلم یش لە هەموو بوارەکاندا سودی سەرەکی لە قورئان وەربگرن بۆ بەهێز کردن و گەشەپێدانی بوارەکەی خۆیان، ئەمەش ڕاستییەکە و بۆیان ڕەخساوە بەو مەرجەی ئەوان بتوانن ڕێگایەکی دروست بدۆزنەوە لە چۆنییەتی هەلهێنجان و وەرگرتنی زانیارییەکان لە قورئانی پیرۆزو، بیریشمان نەچێت مەبەستی سەرەکی لە دابەزاندنی قورئان گفتوگۆ کردنە لەگەڵ دڵەکاندا بەئاراستەی زیندوکردنەوەیان: ﴿أَوَ مَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ..﴾ الأنعام: ١٢٢. ئەمەش بەهیچ شتێکی تر بەرجەستە نابێت و نایەتە دی جگە لە کردنەوەی دەرگای دڵەکانمان بۆ قورئانی پیرۆز.

## قورئان فەڕو بەرەکەتی ژیانمانە

قورئانی پیرۆز فەڕو بەرەکەتی ژیانمانە، پێویستە ئەو ڕاستییە بزانین کە فەڕو بەرەکەت و یەکڕیزی و جوانی ژیانمان و پەروەردەی منداڵەکانمان و سەرفرازیمان پەیوەستە بەدەست گرتنمان بەقورئانەوە، لەم بارەوە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئامۆژگاریمان دەکات بە ئامۆژگارییەکی گەورەو دەفەرموێ: (تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا إِنْ تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللهِ وَسُنَّتِي)[1]، واتە: دوو سەرچاوەم لەدوای خۆم بۆتان بەجێهێشتووە، دەستیان پێوە بگرن هەرگیز گومڕا نابن، ئەوانیش قورئان (کە کتێبی پەروەردگارە)و سوننەتەکانم.

---

١ ) أخرجه الحاكم: ٣١٩، والدار قطني: ١٤٩، والبيهقي: ٢٠١٢٤، وحسنه الألباني في المشكاة: ١٨٦.




پەیوەستە بە دەستگرتنمان بە قورئانەوە

قورئانی پیرۆز هەموو ئەو شتانەی تێدایە کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا پێویستمان پێیانە، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿..وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ..﴾، النَّحل: ٨٩ . واتە: ئێمە قورئانمان ناردوەتە خوارەوە بۆت کە ڕوون کەرەوەیە بۆ هەموو شتێک..

سەرنج بدەن لەم فەرمایشتە جوانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە دەفەرموێ: {كِتَابُ اللهِ، حَبْلٌ مَمْدُودٌ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ}[1]، حەسەنی بەسری بە وتەیەکی جوان ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێ: ئەوانەی پێش ئێوە وەک پەیامێکی دابەزێنراوی ئاسمانی سەیری قورئانیان دەکرد، هەر لەبەر ئەوەبوو شەوان لە ئایەتەکانی ڕادەمان و بەڕۆژیشدا بەکردەوە جێبەجێیان دەکردن.

---

١ ) أخرجه أحمد: ١١١١٩، والترمذي: ٣٧٨٨، صَحِيح الْجَامِع: ٢٤٥٧، الصَّحِيحَة: ١٧٦١

## واتای ڕامان لە قورئان

واتای ڕامان لە زمانەوانیدا: بەواتای وردبونەوە و تێڕامان دێت لەسەر ئەنجام و کۆتایی هەرشتێک.

ڕامان لە دەستەواژە {اصطلاح} دا: بەواتای وردبونەوە و تێڕامان دێت لە قورئانی پیرۆز، بەئامانجی ئامۆژگاری و پەند لێوەرگرتن و لێکدانەوە و سود وەرگرتن لە قورئان و ئەوەی تیایدایە.

زۆرێک لە خەڵکی باوەڕیان وەهایە، کە ڕامان و وردبونەوە کارێکی قورسە بۆ هەموو خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی، ئەوان لەو باوەڕەدان ڕامان لە قورئان تایبەتە بەکۆمەڵێکی تایبەت، لە زانایان و موفەسیرین و ئەهلی قورئان... بەبێگومان ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەیە... ڕامان لە قورئان بابەتێکی زۆر گرنگە بۆ هەموو موسڵمانان بەشێوەیەکی گشتی، بۆ نمونە کاتێک دەچیتە خزمەتی سورەتی {صٓ} و بەسەر ئەم ئایەتە گەورەیەدا تێپەڕ دەبیت کە تیایدا خوای گەروە دەفەرموێ: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ صٓ: ٢٩.

لە کاتێکدا مرۆڤ بەڕامانەوە ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە، دەگاتە ئەو ڕاستییەی وشەی {لِّيَدَّبَّرُوٓاْ} ئاماژەیە بۆ ئەوەی لەسەرمان واجبە ڕامانمان هەبێت بۆ ئایەتەکانی قورئان، بەهیچ شێوەیەک هەست بەتام و چێژی قورئان ناکەین و پەندی لێوەرناگرین ئەگەر ڕامان و وردبونەوەمان نەبێت بۆ واتای ئایەتەکانی قورئان، هەر لەبەرئەوەیە خوای گەورە بەفەرمایشتی شیرینی: {وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ} کۆتایی بەم ئایەتە پیرۆزە هێناوە، مەبەست لەمانەش ئەو کەسانەن کە خاوەنی ژیری و هۆشمەندی و عەقڵی سەنگینن، دوای ئەوەی مانای «ڕامان لە قورئان» مان زانی لەسەرمان پێویستە بەشێوەیەک لە قورئان ورد ببینەوە هەست بەتام و چێژەکەی بکەین.

## جیاوازی نێوان ڕامان لە قورئان و تەفسیری قورئان

بێگومان جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ڕامان لە قورئان و تەفسیری قورئاندا، ڕامان لە زۆر ڕووەوە فراوانترە لە تەفسیر

| ڕامان لە قورئان | تەفسیری قورئان |
| --- | --- |
| ڕامان لە قورئان کاریگەری ڕاستەوخۆ لەسەر دڵی مرۆڤ بەجێ دەهێڵێت و، ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر ئەندامەکانی جەستەی بەهۆی جێبەجێ کردنی ئایەتەکانی قورئانەوە. | بەڵام تەفسیر: بریتییە لە زانیارییەک بۆ عەقڵ و ژیری مرۆڤ. |
| ئامانج لە ڕامان پەند وەرگرتنە لە ماناو مەبەستی ئایەتەکە. | ئامانج لە تەفسیر ڕوونکردنەوەی واتای ئایەتەکانی قورئانە. |
| هەموو موسڵمانان دەتوانن ڕامان و وردبونەوەیان هەبێت بۆ واتای ئایەتەکانی قورئان. | تەنها ئەهلی پسپۆڕی تایبەتمەند و ئەهلی عیلم دەتوانن تەفسیری قورئان بکەن. |
| لە هەموو حاڵەتەکاندا ڕامان لە قورئان واجب و پێویستە لەسەر موسڵمانان. | بەڵام فێربوونی تەفسیر لەسەر هەموو کەسێک واجب و پێویست نییە. |
| ڕامان و وردبونەوە بنچینەی دابەزاندنی قورئانە. | تەفسیر هۆکارێکە و بەهۆیەوە مرۆڤەکان دەگەنە ڕامان و وردبونەوە لە قورئان. |

# گرنگی ڕامان لە قورئانی پیرۆز

## ١

ڕامان و وردبونەوە لە قورئان جێبەجێ کردنی فەرمانی خوایە، وەک دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ﴾ مُحَمَّد: ٢٤. واتە: ئاخۆ ئەوانە وورد نابنەوە لە قورئان و (تێی ناگەن)؟ نەخێر بەو شێوازە نیە، بەڵکو دڵیان قوفڵی لێ دراوە.

## ٢

ئامانج لە دابەزاندنی قورئان بۆ تێڕامانە لە واتای ئایەتەکانی، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ إِلَيْكَ مُبَـٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَـٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ صٓ: ٢٩. واتە: {ئەم قورئانە} کتێبێکی پیرۆزە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ تۆ (ئەی محمد (ﷺ)) ، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە لە ئایەتەکانی، وە خاوەنانی بیرو ژیری پەندی لێ وەربگرن.

## ٣

ڕامان لە قورئان هۆکارێکی سەرەکی بووە بۆ هیدایەتی زۆرێک لە پیاوچاکان، هەروەک لە چیرۆکی موسڵمانبونی سەعدی کوڕی موعازدا زیاتر ئەم ڕاستییەمان دێتە پێش چاوان.

ئەوەش موسعەبی کوڕی عومەیر کە لە شاری مەدینەدا دەستی کردوە بە بانگ کردنی خەڵکی بۆ ئاینی ئیسلام و داواکاری ئاینەکەیان بۆ ڕون دەکاتەوە، لەم ساتەدا سەعدی کوڕی موعاز کە هێشتا موسڵمان نەبووە، بەم هەوڵە بەردەوامەی موسعەب دەزانێت و دەیەوێت بیکوژێت، بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ چەند کەسێکی هۆزەکەیدا و بەچەکەوە دەچنە سەر موسعەبی کوڕی عومەیر بەئامانجی شەهید کردنی، کاتێک دەگەنە لای، ئەو لەو کاتەدا قورئان دەخوێنێتەوەو لە سەرەتاکانی سورەتی {الزُّخرُف} دایە: ﴿حمٓ ۝ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ۝ إِنَّا جَعَلْنَـٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ الزُّخرُف: ١ - ٣. موعاز بەهۆکاری گوێگرتنی لەم چەند ئایەتە پیرۆزە، کاریگەری گەورەیان لەسەری دروست کردو، سەرئەنجام دڵە زیندووەکەی ملکەچ بوو بۆ فەرمایشتی خوای پەروەردگارو نەک هەرخۆی موسڵمان بوو، بەڵکو هۆزەکەیشی بەشوێنیدا موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند.. بەڕاستی ڕامان لە قورئان کارێکی یەکجار گەورەیە.

# بەروبومەکانی ڕامان لە قورئان

## ١- ڕامان لە قورئان هۆکارە بۆ ڕام بوونی دڵەکان

هەندێک لە خەڵکی ئاواتیان ئەوەیە لەگەڵ خوێندنەوەی قورئاندا چاویان پڕ بێت لە فرمێسک، لە کاتێکدا دەگەنە ئەو ئایەتانەی کە کاریگەرییەکەیان هێندە گەورەیە خەریکە شاخەکان بهەژێنن، بەڵام دڵی ئەوان هیچ ملکەچ نابێت!؟ لەبەرئەوە گەورەترین بەروبومەکانی ڕامان لە قورئان و سودەکانی؛ ترسان و شەرم کردنی مرۆڤە لەخوای گەورە و هاتنە خوارەوەی فرمێسکە لە چاوەکانی، خوای پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢﴾ الأنفال: ٢. واتە: بێگومان بڕواداران بەتەنها کەسانێکن، کاتێک باسی خوای گەورە کرا و ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و ترسی لێ دەنیشێت، کاتێکیش ئایەتەکانی خوایان بەسەردا بخوێنرێتەوە، بڕوایان پێی زیاد دەبێت و، هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن.

## ٢- ڕامان لە قورئان هۆکارە بۆ چاکبوونی دڵ

یەک لەپیاوچاکان دەڵێت: (کاتێک لە وتار و ئامۆژگارییەکان ورد دەبینەوە، پاشان دێینە خزمەتی قورئان، هیچ شتێکمان دەست ناکەوێت «هاوشێوەی قورئان و تێگەیشتن لە واتاکەی» بۆ دڵ نەرم کەرەوە بێت و ئارامی و ئاسودەیی پێ بدات).

هەروەها ئیبن قەیم دەفەرموێ: ئەگەر دەتەوێ تێرامانت هەبێت بۆ قورئان و ئایەتێک بخوێنیتەوە، کە بەهۆیەوە دڵت ئۆقرە بگرێت و ئاسودە بێت، ئەوە خوێندنەوەی ئەو ئایەتە لە شەو و ڕۆژێکدا و دوبارەکردنەوەی بۆ ماوەی سەد جار و تەنانەت هەزار جاریش، زۆر چاکترە لەوەی هەموو قورئان بخوێنیتەوە بە خوێندنەوەیەک کە ڕامان و وردبونەوەی لەگەڵدا نەبێت.

## ٢- ڕامان لە قورئان هۆکارە بۆ چاک کردنی ڕەوشت و هەڵسوکەوتمان

بچیتە خزمەتی هەر ئایەتێک لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، خوای گەورە ڕەوشت و هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکی جوانی بۆمان دەست نیشان کردوەو سنوریشی بۆ داناوین و، فەرمانی پێمان کردوە بۆ جێبەجێ کردنی هەموو کارو کردەوەیەکی جوان و، هەموو جۆرە تاوان و کارو کردەوەیەکی خراپ و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی لێ حەرام کردوین...

خوشک و برای باوەڕدارم لەگەڵمدا ورد ببەرەوە لە فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجْتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا..﴾، الحُجُرَات: ١٢. خۆت وەها دابنێ کە تێرامانت هەبووە لەبەردەم ئەم پرسیارانەدا: (ئایا من گومانی خراپ بەخەڵکی دەبەم؟!)، (ئایا لەو جۆرە کەسانەم کە غەیبەتی خەڵکی دەکەن؟!)، ( ئایا لەو جۆرە کەسانەم کە جاسوسی بەسەر بەندەکانی خواوە دەکەن؟!)، دەبێت بەو شێوازە خۆمان بەڕەوشتە قورئانییەکان برازێنینەوە.

نمونەیەکی تر... لە کاتێکدا ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە دەخوێنیتەوە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ١٠﴾ النِّسَاء: ١٠.

(ئایا من ماڵ و سامانی هەتیوانم بەناڕەوا خواردووە؟!)، (ئایا من دادگەرم لەچۆنییەتی دابەشکردنی سەروەت و سامان بەسەر ئەو کەسانەی کە مافیان لەلامە؟!)... بێگومان خوای گەورە هەموو ئەم یاسایانەی دارشتوە بۆمان، تا ببنە بەڵگەو ڕێنیشاندەری بەندەکان، هەموو ئەمانەش بەدی نایەن تەنها بەڕامان و قاڵبونەوەی قوڵمان نەبێت لەواتای ئایەتەکان و جێبەجێ کردنی فەرمان و ڕێگرییەکانی ناو ئایەتەکان.

گومانی تێدا نیە پەیوەندی بەردەوامی مرۆڤی موسڵمان لەگەڵ قورئانداو هاوڕێیەتی کردنی و هۆگربوون لەگەڵیدا سات بە سات و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، دەیگەیەنێتە جۆرێک لە ئاوێتە بوون لەنێوان واتای ئایەتەکان و نهێنییەکانیانداو، بەم هۆکارەوە دەگاتە چەندین بەڵگەو ڕاستی کە پێشتر پەی پێ نەبردون، سەرئەنجام قورئان دەبێتە بەشێک لە جەستەیی و، لەژێر تیشکی قورئان ڕێ دەکات و، بەکردەوە داواکارییەکانی قورئان جێبەجێ دەکات و، دواجار بەم هۆکارەوە دەبوژێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ..﴾، الزُّمَر: ٢٣.

واتە: خوا جوانترین فەرمایشتی ناردوەتە خوارەوە، قورئانێکە کە {ئایەتەکانی} لەیەکچووی دووپاتکراوەن، ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پیا دێت {بەبیستنی قورئان}، پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێت بەیادی {قورئانی} خوا.

## ٤- ڕامان لە قورئان هۆکاری دورکەوتنەوەیە لە زوڵم و ستەمی نەفس

بەهەمان شێوە لە بەروبومەکانی ڕامان لە قورئان: دورکەوتنەوەیە لە هەموو ئەو شتانەی کە خوای پەروەردگار دەربارەیان هۆشداری پێمانداوە، گومان لەوەشدا نیە گەورەترین زوڵم و ستەمیش بریتییە: لە پشت هەڵکردن لە قورئانی پیرۆز: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ..﴾ الكهف: ٥٧. واتە: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە ئامۆژگاری کرابێت بەئایەتەکانی پەروەردگاری، بەڵام ئەو گوێی پێ نەداو ئەو تاوانانەی کە کردویەتی بیری خۆی بباتەوەو..



لـەم بەشـەدا باسـی هەمـوو ئـەو هۆكارانـە ناكەیـن كـە هـاوكاری مـرۆڤ دەكـەن بـۆ رامـان لـە قورئـان، بـەڵام چەنـد هۆكارێكـم دیـاری كـردووە ئەگـەر جێبەجێیـان بكەیـن ئـەوا رامـان و وردبونەوەمـان لـە قورئانـی پیـرۆز زۆر بـۆ ئاسـان دەكـەن، دەبێـت ئـەو ڕاسـتییە بزانیـن كـە لەگـەڵ ئـەم هۆكارانـەدا چەندیـن هـۆكاری تـر بونیـان هەیـەو كاریگەرییەكەشـیان لـە كەسـێكەوە بـۆ كەسـێكی تـر جیـاوازە.

## خۆشەویستی خوای گەورە

هەركەسـێک بەڕاسـتی خـوای گـەورەی خـۆش ویسـت، ئـەوە بەدڵنیاییـەوە قورئانی پیرۆزیشـی خـۆش دەوێت، لەكاتی خوێندنـەوەی قورئانـدا هەسـت بـەوە دەكەیـت ئەمـە فەرمایشـتی ئـەو زاتەیـە كـە خۆشـت دەوێـت... هەسـتەكانت دەگۆڕێـن و كارلێـک دەكـەی لەگـەڵ وشـە بەوشـەی قورئانـداو، ملكـەچ دەبیـت بـۆ فەرمانەكانـی و لـە قەدەغەكراوەكانیشـی دور دەكەویتـەوەو ئومێـدت بەڕەحمـی خـوا هەیـە، قورئـان فەرمایشـتی خـوای پـەروەردگارە! ئـەو پـەروەردگارەی كـە دروسـتكەرو ڕۆزی دەرمانـە، خـوای گـەورە ڕوو دەكاتـە ئـەو كەسـانەی كـە بانگەشـەی خۆشویسـتنی ئـەو دەكـەن و دەفەرمـوێ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴿٣١﴾﴾ آل عمـران: ٣١. بەڵـێ ئەگـەر تـۆ بەڕاسـتی خـوای گـەورەت خـۆش دەوێـت، ئـەوە ڕەوشـت و گوفتـارو هەڵسـوكەوتت بگـۆڕەو هیـوات بـەوە هەبێـت كـە خۆشەویستەكەت لێـت ڕازی دەبێـت.

## باوەڕت بەوە هەبێت کە قورئان ڕێنیشاندەرە

لەو هۆکارانەی کە هاوکاریت دەکەن لەسەر ڕامان و وردبونەوە لە قورئانی پیرۆز، ئەوەیە: باوەڕی تەواوەتیت بەوە هەبێت کە قورئان سەرلەنوێ ژیانت پێ دەبەخشێتەوەو بەرچاوت ڕۆشن دەکاتەوەو ڕێت نیشان دەدات، بەبێ قورئانیش دوچاری سەرلێشێواوی دەبیت و ژیانت خاڵی دەبێت لە ژیانێک کە ڕاستەقینەیەو واتای ژیان دەگەیەنێت، هەروەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَوَ مَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا..﴾ الأنعام: ١٢٢.

واتە: ئایا کەسێک کە مردوو بێت {واتە بێبڕوا بێت} و ئێمە زیندومان کردەوە {هیدایەتماندا‌و} ڕوناکییەکمان بۆ فەراهەم هێنا {کە قورئانە} بەهۆی ئەوەوە لەناو خەڵکیدا دەگەڕێت و دەڕوات، ئایا وەک ئەوە وەهایە کە لەناو تاریکستانێکدا بێت کە بەهیچ جۆرێک دەرچونی لێ نیە...

بەبێ قورئانیش ژیانمان هاوشێوەی جەستەیەکی بێ گیانە، هەروەک لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا..﴾، الشُّورىٰ: ٥٢. واتە: هەر بەو شێوە کە {وەحی پێ دێت} بەفەرمانی خۆمان قورئانمان بۆ تۆ نارد {ئەی ﷺ}، کە تۆ نەتدەزانی کتێب و ئیمان چییە، بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە ڕووناکییەک و ڕێنمونی هەرکەسێکی پێ دەکەین کە بمانەوێت لە بەندەکانی خۆمان و..

بێ گومان ڕۆح نهێنی ژیانەو، چۆن مرۆڤ بەبێ ڕۆح مردووە، بەهەمان شێوە قورئانیش بریتییە لە ڕۆح و، ژیانێک بەبێ قورئان ژیان نیەو هیچ واتایەکی نیە.

## گفتوگۆ کردن لەگەڵ دڵدا

تێگەیشتن لەو پەیوەندی و ژیانە تایبەتەی دڵ کە بەهۆی قورئان و خوێندنەوەی قورئانەوە دروست دەبێت، هۆکارێکە لە هۆکارەکانی رامان و وردبونەوە لە قورئان، خوای پەروەردگار لە قورئاندا بەجوانترین شێوە ئامۆژگاریمان دەکات و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ ق: ٣٧. واتە: بێگومان لەم {باسەدا} پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسێک خاوەن دڵێکی {زیندوو بێت یان ژیر بێت}، یان گوێ بگرێت بۆ {قورئان} و بیریشی لەلای بێت.

پێویستە ئاگاداری ئەوەبین کە لە قورئاندا ئامۆژگاری و بیرخستنەوە ئاراستەی ئەو کەسانە دەکرێت کە خاوەنی عەقڵ و ژیری و هۆشمەندین، نەک هەبوونی گوێچکەو زمان.

لەکاتی خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئاندا هەوڵ بدە واتای ئایەتەکان ئاراستەی دڵت بکەی، چەند جارێک دووبارەیان بکەرەوە هەتا وشەکان لە دڵتدا جێگە دەگرن، وەک خوای پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ۝١٩٣ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ۝١٩٤﴾ الشُّعَرَاء: ١٩٢ - ١٩٤.

چونکە ئامانجە گەورەو سەرەکییەکەی دابەزاندنی قورئان بۆ رامان و وردبونەوەیە لە واتاکەی: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ۝٢٤﴾ مُحَمَّد: ٢٤. واتە: ئاخۆ ئەوانە وورد نابنەوە لە قورئان و {تێی ناگەن}؟! {نا بەو شێوازە نییە} بەڵکو دڵیان قوفڵی لێدراوە.

رامان و وردبوونەوە لە قورئان ئارامی بە دڵی مرۆڤ دەبەخشێت و سینەی فراوان دەکات، تەنها قوفڵ و داخرانی دڵەکان رێگرن لە گەیشتنی مرۆڤ بەم ئارامییە، بیریشمان نەچێت لەیەک کاتدا چەندین

قوفڵ دەدرێت لە دڵەکان، بەو شێوازە ئەگەر دڵەکان قورئان و وردبوونەوە لە قورئانیان تیادا نەبوو، ئیدی قوفڵیان لێ دەدرێت، دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین کە ژیانی دڵ تەنها بەقورئان و لەگەڵ قورئانبوندا بەرجەستە دەبێت.

زۆرێک لە خەڵکی پرسیاری ئەوەم لێ دەکەن و دەڵێن: ئایا بە چ شێوازێک دڵەکەم بە قورئان زیندو بکەمەوە؟ بە چ شێوازێک چارەسەری ڕەقی دڵم بکەم؟

بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە لەناو خودی قورئاندایە.. نزیکایەتی تۆ لەگەڵ قورئانداو خوێندنەوەی بەشێوەیەکی بەردەوامی ڕۆژانە دڵێکی نەرم و ئارامت پێ دەبەخشێت و، بەپێچەوانەشەوە دورکەوتنەوەت لە قورئان و دەور نەکردنەوەی دڵت ڕەق دەکات.. وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ..﴾ الحَدِيد: ١٦.

واتە: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران کە دڵیان ڕاچڵەکێت و ملکەچ بێت بۆ یادو زیکری خواو، ئەو قورئانەی کە ناردویەتییە خوارەوە؟



دواتر خوای گەورە دەربارەی هۆکاری ڕام نەبونی دڵ لەبەردەم قورئاندا دەفەرموێ: ﴿..وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴿١٦﴾﴾ الحَديد: ١٦. واتە: .. وەک ئەو کەسانە {جولەکەو گاور} نەبن کە لەمەو پێش کتێبی ئاسمانییان پێدراو، ماوەیەکی دوورو درێژیان بەسەردا تێپەڕی ئینجا دڵیان ڕەق بوو، وە زۆربەیان لەسنور دەرچوو بوون.

بەو واتایەی: لەنێوان ئەوان و قورئاندا ماوەیەکی زۆر دوورو درێژو تولانی بوونی هەبووەو بۆ ماوەیەکی زۆر قورئانیان نەکردووەتەوەو ئایەتێکیان نەخوێندووەتەوە، یاخود بەلانی کەمەوە ورد نەبونەتەوە لەناوەڕۆکی ئایەتێک، دواجاریش سەرئەنجامەکەی بەو شێوازەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾... بەڵێ ئێمە ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان بەرگی قورئانەکانمان دەکەینەوەو لەگەڵ ئەوەشدا داوای ژیانەوەی دڵمان و نەرمبونەوەی دەکەین؟!!

لەو هۆکارە گەورانەی کە دڵمان بەزیندویی دەهێڵنەوەو دەیخەنە ژێر کاریگەری قورئانەوە ئەوەیە کە ئەو هەستەت هەبێت خوای گەورە لەگەڵ خودی خۆتدا قسە دەکات.

لەکاتی خوێندنەوەی ئایەتەکاندا لە دڵی خۆتدا وەهای دابنێ کە قورئان ئێستا بۆ تۆ دادەبەزێت، با ئەو هەستەت هەبێت کە خوای گەورە بەتەنها لەگەڵ تۆدا قسە دەکات.

لەگەڵم دا چیرۆکی فضیلي کوڕی عیاض بخوێننەوە، کاتێک گوێی لەم چەند ئایەتەی سەرەوە دەبێت، سەرتاپای ژیانی دەگۆڕن.

ئەمە لەکاتێکدایە فضیلي کوڕی عیاض ناسراوترین و ترسناکترین چەتەو ڕێگرەکانی سەردەمی خۆی بوو، حەزی لە ئافرەتێک بوو زۆر خۆشی دەویست، لەیەک لە شەوەکاندا بەسەر دیواری حەوشەی ماڵی ئافرەتەکەدا سەرکەوت بەئامانجی ئەنجامدانی کاری خراپ لەگەڵیدا، لەو ساتەدا فضیل لەسەر دیوارەکەوە گوێی لە ماڵە دراوسێکەیان بوو کە قورئانی دەخوێندەوەو، ئایەتێکی گەورەو دڵهەژێن بەرگوێی فضیل کەوت و پێش گوێچکەکانی، دڵی بۆ واتای ئایەتەکە کردەوە کە تیایدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ..﴾ الحَدید: ١٦. فضیل ڕاستەوخۆ و بەبێ دوو دڵی وتی: بەڵێ پەروەردگارا ئێستا کاتی ئەوەیە دڵەکەم ڕام بکەم بۆ زیکرو یادی تۆو ئەو قورئانەی داتبەزاندوە.

بەشێوەیەک گوێی بۆ ئایەتەکە هەڵخستبوو وەک ئەوەی خوای گەورە بەتەنها لەگەڵ ئەودا قسە بکات، سەرئەنجام ئەم ڕوداوە ژیانی فضیلي گۆڕی بۆ ژیانێکی زۆر جیاوازتر لەوەی پێشوی، ئەو لە بەناوبانگترین چەتەو ڕێگرەکانەوە بوو بە بەناوبانگترین پیاوچاکانی سەردەمی خۆیی و، ڕامان و دڵکردنەوەی بۆ تەنها ئایەتێک کردی بە خواپەرستێکی بەردەوامی تەنیشت کەعبەی شەریف.

داواکارم لەخوای پەروەردگار دڵ و سینەمان بکاتەوە بۆ پەیامەکەی خۆی.

پێویستە بزانین خوای گەورە ئەم قورئانەی بەئامانجی ژیاندنەوەی دڵی مرۆڤەکان دابەزاندوە بەشێوەیەکی گشتی و تەنها تایبەتی نەکردوە بەدڵی کەسێکەوەو، ئەمەش بەو واتایە دێت کە ئەم قورئانە قسە لەگەڵ هەموو باوەڕدارانیدا دەکات کەسی گوناهبارو کەمتەرخەم ڕێگای تەوبەی خۆی لە قورئانەدا دەدۆزێتەوەو، چاکەکاریش لەکاتی ئەنجامدانی کارو کردەوە چاکەکانیدا ڕێگای بەردەوامی و دامەزراوی خۆی لە قورئانەدا دەدۆزێتەوە.

خوای گەورە ئەم قورئانەی کردووەتە هۆکاری ژیاندنەوەی هەموو دڵەکان و، ڕێگای هیدایەت و سۆزو بەزەییەو، ناکرێت بڵێین: ئەم قورئانە قسە لەگەڵ چینێکی دیاریکراوی باوەڕداراندا دەکات، بێگومان ئەمە شتێکی ئەستەمە.

با هیچ کەسێک نەڵێت لەنێوان من و قورئاندا بەربەستێک هەیەو قورئان قسە لەگەڵ من ناکات و، یاخود من ئەهلی ئەوە نیم، لە ڕاستیدا قورئان گفتوگۆ لەگەڵ هەمومان دەکات و هەموان پێداویستی خۆمان لەم قورئانەدا دەدۆزینەوە، داناکان دانایی و، زاناکان زانایی تێدا دەدۆزنەوەو، گوناهبارانیش تەوبەو چاکەکارانیش شوکرانەبژێری و...، هەموو کەسێک ئەوەی دەیەوێت لەم قورئانەدا دەیدۆزێتەوە.

**شێخ صالح المغامسي**

## جوان دەربڕینی پیتەکان

خوێندنـەوەی قورئـان و جێبەجـێ کردنـی یاسـاکانی تەجوید هۆکارێکـە بـۆ رامـان و وردبونـەوە لـە قورئـان، پێویسـتە ئـاگاداری ئـەوە بین خوێندنـەوەی قورئان و جێبەجێ کردنی یاساکانی تەجوید پەیوەنـدی بەدەنـگ خۆشـییەوە نیـە؟ چونکـە خوێندنـەوەی قورئـان فەرمانێکـی پـەروەردگارە بـۆ هەمـوو موسـڵمانان، ئـەم قورئانـە وتـەی خـوای گەورەیـەو جیـاوازە لەوتـەی مرۆڤـەکان و، پەڕاوەکەشـی وەک هـەر پەڕاوێکـی تـر نیـە، هـەر لەبەرئەوەیـە کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرمویەتـی: {زَيِّنُـوا الْقُـرْآنَ بِأَصْوَاتِكُـمْ، فَـإِنَّ الصَّـوْتَ الْحَسَـنَ يَزِيـدُ الْقُـرْآنَ حُسْـنًا}[1]، واتـە: قورئـان برازێننـەوە بەدەنگتـان، چونکـە دەنگخۆشـی قورئـان جوانتـر دەکات. گومـان لـەوەدا نییـە کـە ئـەم فەرمـودە فەرمانێکـی گشـتییە بـۆ هەمـوو موسـڵمانان.

ئیبنـو کەسـیر لـە تەفسـیری ئایەتـی: ﴿..يَتْلُونَـهُۥ حَـقَّ تِلَاوَتِـهِۦٓ..﴾، دەفەرمـوێ: ئەمـە واتـای ئـەوە دەگەیەنێـت لـە کاتێکدا ئەگـەر ویسـتت قورئانـی پیـرۆز بخوێنیتـەوەو بەڕاسـت و دروسـتی دەوری بکەیتـەوە، پێویسـتە بەئامادەیـی دڵتـەوە بچیتـە خزمەتـی قورئـان و بەجوانتریـن شـێوە وشـەکان دەرببڕیـت و تێرامـان و وردبونـەوەت هەبێـت بـۆ واتاکانیـان.

بـۆ نمونـە ئەگـەر ویسـتت ئـەم چەنـد ئایەتـەی سـورەتی {الأنعـام} بخوێنیتـەوە: ﴿..وَمَـن يُـرِدْ أَن يُضِلَّـهُۥ يَجْعَـلْ صَـدْرَهُۥ ضَيِّقًـا حَرَجًـا كَأَنَّمَـا

١ ) أخرجـه أحمـد: ١٨٥١٧، والنسـائي: ١٠١٥، وأبو داود: ١٤٦٨، وابـن ماجه: ١٣٤٢، والدارمي: ٣٥٠١ انظـر: صَحِيح الْجَامِـع: ٣١٤٥، صفة الصلاة ص ١٢٥.

﴿يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ..﴾ لە کاتێکدا بەتەجویدەوە ئایەتەکە دەخوێنێتەوەو دەگەیتە ﴿يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾، مەددی لکاو لە وشەی ﴿ السَّمَاءِ﴾دا چوار یان پێنج حەرەکە درێژی دەکەیتەوە... لەو کاتەداو لەگەڵ واتای ئایەتەکەدا هەست بە بەرزبونەوە دەکەیت بەرەو ئاسمان! بەو مەرجەی خوێندنەوەکە مافی خۆی پێ بدەیت، کەواتە کاتێک قورئان دەخوێنیتەوە بزانە کە تۆ لە خزمەت پیرۆزترین پەڕاودایت و با خوێندنەوەکەت هاوشێوەی خوێندنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان نەبێت، بەڵکو لە خوێندنەوەی قورئاندا پەیوەستبە بەفەرمانی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە دەفەرموێ: ﴿..وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا﴾ المُزَّمِّل: ٤. واتە: لەسەرخۆ قورئان بخوێنەرەوەو {بەرێک و پێکی} دەوری بکەرەوە.

لەپێناو گەیشتنت بە وەعدو بەڵێنی خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿..كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا﴾ الفُرقَان: ٣٢. واتە: ئا بەو جۆرە {قورئانمان دابەزاندوە} بۆ ئەوەی دڵی تۆ {ئەی محمد} بەو قورئانە دامەزراو و بەهێز بکەین، {وە بەو بۆنەیەوە} ئایەتانی خۆمم بۆ ناردن بەرە بەرە.

## ڕازاندنەوەی دەنگتان بەقورئان

خوێندنەوەی قورئان بەدەنگەوە هۆکارێکی گەورەیەو هاوکاریت دەکات بۆ ڕامان و وردبونەوەی زیاتر لە قورئانی پیرۆز، گوێگرتن لە قورئانخوێنە دەنگخۆشەکان وا لە گوێگر دەکات لەگەڵ خوێندنەوەی ئایەتەکاندا تێڕامان و وردبونەوەی بەردەوامی هەبێت بۆ واتای ئایەتەکان، نمونەی ئەمەش بەسەر پێغەمبەری

ئازیزدا(ﷺ) هاتوە، ئەمە لە کاتێکدایە قورئان بۆ سەر دڵی نازداری ئەو دابەزیوەو بەدەنگە خۆشەکەی خۆی قورئانی دەخوێندەوەو بەوردی لە واتاکەی ڕادەما، بەڕائی کوڕی عازب دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشنوێژی بۆ کردین لە نوێژی خەوتناندا سورەتی: {وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ} ی بۆمان خوێندەوە، بەڕاء دەفەرموێ: {لە ژیانمدا هیچ دەنگێکم گوێ لێ نەبوە لە دەنگی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشتربێت}!.

بێگومان ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا دەنگی خۆی ڕازاندوەتەوەو، دوای گوێگرتنیشی بۆ ئەبوموسای ئەشعەری کە بەدەنگە خۆشەکەی قورئانی دەخوێندەوە، پێی فەرموو: {لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ}[1]. واتە: بەڕاستی لە دەنگخۆشییەکانی ئالی داوودت پێ بەخشراوە. ئەبو موساش لە وەڵام دا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر بمزانیایە گوێم بۆ دەگری، ئەوە زیاتر دەنگم دەڕازاندەوە.

## بێ دەنگی و ئارامی

ئەگەر بتەوێت شارەزا بیت لە قورئانی پیرۆز، پێویستە کاتێکی تایبەتی خۆتی بۆ تەرخان بکەیت و خەڵوەت بکێشیت و بەخشوع و ملکەچییەوە بچیتە خزمەتی، بۆ بەدیهێنانی ئەمەش ئامادەکاری پێشوەختەت دەوێت و، پێویستت بەوە هەیە لە ژینگەیەکی ئارام داو دوور لەجەنجاڵی و ژاوە ژاو بچیتە خزمەتی قورئان، ئەگەر بەو

١ ) أخرجه البخاري: ٤٧٦١، ومسلم: ٢٣٦، والترمذي: ٣٨٥٥، والنسائي: ١٠٢١.

شـێوازەت کـرد ئـەوە سـەرئەنجام ئـەوەی پێشـتر نەتبینیـوەو لێـت شـاراوە بـووە لـە ئارامـی و ئاسـودەیی دەرون و... بـەو هـۆکارەوە پێـت دەبەخشـرێت، هەمیشـە بیـر لـە فەرمایشـتی پـەروەردگار بکـەرەوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّمَـا يَسْـتَجِيبُ ٱلَّذِيـنَ يَسْـمَعُونَ وَٱلْمَـوْتَىٰ يَبْعَثُهُـمُ ٱللَّهُ ثُـمَّ إِلَيْـهِ يُرْجَعُـونَ﴾ الأنعـام: ٣٦. واتـە: بەڕاسـتی تەنهـا ئەوانـە وەڵامـی تـۆ ئەدەنـەوە کـە {بـەدڵ} ئەبیسـتن، مردووەکانیـش {ئەوانـەی بـاوەڕ ناهێنـن} خـوا زیندویـان دەکاتـەوەو پاشـان هـەر بـۆ لای خـوا دەگەڕێنـەوە.

## شێوازی وەستان و دەستپێکردنەوەی دروست

زۆرێـک لـە خەڵکـی حـەز بـەوە دەکـەن زیاتـر لـە جارێـک قورئـان خەتـم بکـەن، بەتایبـەت لـە مانگـی ڕەمەزانـدا خەڵکـی پێشـبڕکێ دەکـەن بـۆ ئـەوەی جارێـک و دوجـار... قورئـان خەتـم بکـەن، بێگومـان ئەمـەش کارێکـی گـەورەو پیـرۆزە، بـەڵام لەکاتـی خوێندنـەوەو وردبوونەوەمـان لـە قورئـان لەسـەرمان پێویسـتە لەسـەر واتـای ئایەتـەکان بووەسـتین و هەڵوێسـتە بکەیـن، نابێـت خەمـی خوێنـەر تەنهـا لێبونەوەبێت لـە خوێندنـەوەی جوزئـی زیاتـر، بەڵکـو بەشـێوازێکی دروسـت تەرکیـز دەخاتـە سـەر ئـەو دوعـاو پاڕانەوانـەی کـە ڕۆژانـە دەیانخوێنێت، هەوڵـی بـۆ ئەوەیـە وەسـتان و دەسـتپێکردنەوەکانیان بەشـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـت بێـت، بەتایبـەت لـە سـورەتە درێژەکانـدا کـە خوێنـەر ناچـار دەبێـت لـە ناوەڕاسـتەکانیاندا بوەسـتێت.

لەسەرت پێویستە دەستپێکردنت دەست پێکردنێکی دروست بێت، بۆ نمونە ئەگەر لە خزمەت سورەتی {آل عمران} دایت: ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ١٩٣ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ١٩٤﴾ آل عِمرَانَ: ١٩٣ – ١٩٤.

لەم چەند ئایەتەدا باوەڕداران لە خوای گەورە دەپاڕێنەوە لە تاوانەکانیان خۆش بێت و لە ڕۆژی دواییشدا ڕزگاریان بکات، لەبەرئەوە کاتێک لە خزمەت نمونەی ئەم چەند ئایەتەدایت دروست نیە قورئانەکە دابخەیت و بڵێی ڕۆژی دواتر خوێندنەوەی ئایەتەکان تەواو دەکەم، تەنانەت ئەگەر ئەمە کۆتایی لاپەڕەکەو کۆتایی ئەو چەند ئایەتە بێت کە پشکی خوێندنەوەی ڕۆژانەتە، نابێت بەتەواو کردنیان قورئانەکە دابخەیت، بەڵکو تەواوکردنی وەڵامی ئایەتەکان گرنگە: ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ..﴾ آل عِمرَانَ: ١٩٥. چونکە واتاکە تەواو و کامڵ دەکات، دواتر بوەستە بۆ ڕامان و وردبونەوە لە ناوەڕۆکەکەی، کەواتە: بەشێوەیەک قورئان مەخوێنەرەوە کە ئامانجت زیادکردنی ژمارەی خەتمەکانت بێت بەبێ ڕامان و وردبونەوە لەوەی کە دەیخوێنیتەوە.



### نمونە لەسەر وەستانی خراپ

١-خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿فَوَيۡـلٞ لِّلۡمُصَلِّـينَ ٤﴾ المَاعُـون: ٤. واتـە: وای بـۆ نوێژکـەران.!؟

سـەرنجی ئـەوە بدە هـەر کەسـێک لەسـەر ئـەم ئایەتـە بوەسـتێت دوچـاری سەرسـوڕمان دەبێـت!! بۆچـی؟ چونکـە نوێژخوێنـەکان خۆشەویسـتی خـوای گـەورەن و بەڵێنی پاداشـت دانەوەیـان پـێ دەدات بـە چاکتریـن شـێوەو پلەیـان بـەرز دەکاتـەوەو.. ئـەی چـۆن دەکرێـت هەڕەشـەی (وَيۡـل) یـان لـێ بکات؟ جا ئەگـەر ئایەتەکـەت گەیاند بـەوەی دوای خۆیـی و تـەواوت کـرد، بـۆت دەردەکەوێـت ئـەم هەڕەشـەیەی خـوای گـەورە بـۆ ئـەو کەسـانەیە کـە نوێژەکانیـان دوادەخـەن و کەمتەرخەمـن لـە ئاسـتیانداو بەخشـوعەوە ئەنجامیـان نـادەن.

٢- خـوای گـەورە لـە ئایەتێکـی تـردا دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذۡ تَـأَذَّنَ رَبُّكُـمۡ لَئِـن شَـكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُـمۡۖ وَلَئِـن كَفَرۡتُـمۡ إِنَّ عَـذَابِي لَشَـدِيدٞ ٧﴾ إبرَاهِيـمَ: ٧. واتـە: {بیریـان بخـەرەوە} کاتێـک کـە پەروەردگارتـان ڕایگەیانـد: سوێند بێت بێگومـان ئەگـەر ئێوە سوپاسـی {چاکـەی} من بکـەن، ئـەوا بۆتـان زیـاد دەکـەم، بـەڵام بێگومـان ئەگـەر شـوکرانەبژێر نەبن! ئـەوە بەڕاسـتی سـزای مـن زۆر بەتینـە.

کەسێک ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە: ﴿وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ﴾، پاشان لێرەدا دەوەستێت! چۆن و بە چ شێوازێک خوای گەورە نیعمەتی زیاتر بەسەر باوەڕداران و بێباوەڕاندا دەڕژێنێت بەبێ جیاوازی؟ کاتێک هەموو ئایەتەکەی خوێندەوە، ئینجا تێدەگات کە خوای گەورە بەڵێنی سزایەکی توندی بەبێباوەڕان داوەو، لەبەرانبەریشدا بەڵێنی داوە نیعمەتی زیاتر بە باوەڕداران بدات.



### نمونە لەسەر وەستانی جوان

لە نمونەی ئەم جۆرە وەستانەش، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾، پاشان دەوەستێت و ئایەتەکە دوبارە دەکەیتەوە: ﴿..تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ١٩٦ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ١٩٧﴾ آل عِمرَانَ: ١٩٦ – ١٩٧.

ئەم شێوازی وەستانە بەجوانترین شێوە واتای ئایەتەکە ڕون دەکاتەوە، تا ئەو ئاستەی «ئەگەر پێشنوێژیت دەکرد» نوێژخوێنەکان بەشێوازێکی جوان لەماناو مەبەستی ئایەتەکە تێدەگەن.

## زانینی ئامانجی سورەتەکان

لەکاتی خوێندنەوەی قورئانداو دوای تەواو کردنی سورەتێک، دواتر دەستدەکەین بەخوێندنەوەی سورەتێکی تر، بەلاّم ئامانج و مەبەستی سورەتەکەو ئەو تەوەرانەمان بیردەچێت کە سورەتەکە باسیان لێوە دەکات، بۆ نمونە سورەتی {الفَاتِحَة} کە ڕۆژانە بەشێوەیەکی بەردەوام لە نوێژەکانماندا دەیخوێنینەوە، ئەگەر ویستمان لێی ڕابمێنین: ئەوە سەرەتا پێویستە ئەم یاسایەی لەسەر جێبەجێ بکەین: بێگومان سورەتی {الفَاتِحَة} گەورەترین سورەتی قورئانەو، بنچینەکانی ئەم ئاینەو بنچینەکانی ژیانی لەخۆی گرتوە، لە کاتێکدا کە دەست بەخوێندنەوەی سورەتەکە دەکەین: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝﴾، لێرەدا ئاشنا دەبین بە عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی و تاک و تەنهایی خوای گەورە.

لە کاتێکدا دەڵێین: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝﴾ ئاشنا دەبین بە عیبادەت و بەندایەتی، کەواتە: یەکەمین تەوەری سورەتەکە بریتییە لە عەقیدەو بیروباوەڕ، پاشان بەندایەتی.

دواتر دەڵێین: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝﴾ ، لێرەدا سورەتەکە بەرنامەی ژیانمان فێر دەکات، کەواتە: ئەگەر ڕۆژانە بەشێوەیەکی ورد لێی ڕابمێنین تێدەگەین کە ئەم سورەتە سێ تەوەری سەرەکی لەخۆی گرتوە!.

نمونەیەکی تر: سورەتی {الكَهْف} هەموو ڕۆژانی هەینییەک دەیخوێنینەوە، ئەگەر یاساکەمان بەسەریدا جێبەجێ کردو، تەوەری سورەتەکەمان زانی و، بۆمان دەرکەوت کە پەروەردگار چ ئامانجێکی هەیە لە ناردنە خوارەوەی ئەم سورەتەداو، لە تەوەرەکانی دا چ پەندو عیبرەتێک بوونی هەیەو، ئەگەر توانیمان لێی ورد ببینەوە ئەوە لەکاتی

خوێندنەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم سورەتە دەکرێت بەچوار بەش و چوار تاقیکردنەوەوە، لەدوای باسکردنی ئەو چوار تاقیکردنەوەیە، ئەو ئایەتانە دێن کە بەهۆیانەوە دەتوانین خۆمان لە دەجال بپارێزین و، هەروەک پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاریمان دەکات بەخوێندنەوەو لەبەرکردنی ئەو ئایەتانە کە مەبەست دە ئایەتی سەرەتای سورەتەکەیە.

## زانینی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵاندا نوێژی عەسریان ئەنجامدا، دواتر هاوەڵێک هاتە خزمەتی و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئافرەتێکم ماچ کردو لە ئامێزم گرت! لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاریگەری ڕووداوەکە ڕەنگی سور هەڵگەڕاو بەتوڕەییەوە ڕووی لە کابرا وەرگێڕاو دواتر هاوەڵەکە ڕۆیشت، زۆری پێ نەچوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردی بەشوێنی داو دوای ئەوەی پیاوەکە هاتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش لێی پرسی: ئایا نوێژی عەسرت لەگەڵماندا ئەنجامدا؟ هاوەڵەکە وتی: بەڵێ، دواتر پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم ئایەتەی سورەتی {هُـود} ی بەسەردا خوێندەوە کە تیایدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤﴾ هُـود: ١١٤. واتە: نوێژ ئەنجام بدە لەم سەرو ئەوسەری ڕۆژدا {لە بەیانیان و ئێوارانـدا} و لە بەشێک لەشەودا؟ چونکە بەڕاستی {کردەوە} چاکەکان، {کردەوە} خراپەکان لادەبەن و دەیانسڕنەوە، ئەوە پەندو ئامۆژگارییە بۆ پەند وەرگران. پیاوەکەش بەدابەزینی ئایەتەکە زۆر دڵی خۆش بوو، دواتر موژدەی دایە هاوەڵان و ئەوانیش دەربارەی ئایەتەکە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد بەوەی ئەم ئایەتە تایبەتە بەم پیاوە یاخود گشتگیرە بۆ هەمووان؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ)

لە وەڵامدا فەرمووی: بێگومان ئەم ئایەتە گشتگیرەو هەموو کەسێک دەگرێتەوە.

دوابەدوای ئەوەی ئاشنابون بەم ئایەتە پیرۆزەو، هۆکاری دابەزینی ئایەتەکەتان زانی، پرسیارێکتان ئاراستە دەکەم: لەکاتی گەیشتنتان بەم ئایەتەی سورەتی هود، ئایا دڵتان زیاتر لە جاران ملکەچ نابێت؟ ئایا زیاتر لەواتای ئایەتەکە ورد نابنەوە؟ ئایا هەست بەگەورەیی و پێگەی نوێژ ناکەن کە وەرێنەری تاوانەکانی مرۆڤە {إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ}، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت چەندە لە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان شارەزا بین، ئەوا گەورەیی قورئانمان لە بوارێکی دیکەوە بۆ دەردەکەوێت و دڵمان ملکەچ دەبێت و، ئەمەش هاوکاریمان دەکات بۆ کارکردن بە قورئانی پیرۆز.

## گەورەیی و پلەو پایەی سورەت و ئایەتەکان

لە کاتێکدا خوای پەروەردگار ئەم قورئانەی بۆمان دابەزاندوە، پێویستە بزانین کە هەموو قورئان بەبێ جیاوازی پیرۆزە، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەندین ئایەت و سورەتی دیاری کردوە کە پلەو پایەیان زۆر گەورەو پیرۆزە، بەدڵنیاییەوە زانینی گەورەیی ئەم ئایەت و سورەتانە یارمەتیمان دەدەن بۆ ڕامان و وردبونەوە لە قورئانی پیرۆز.

بۆ نمونە ئەگەر زانیمان {آية الكرسي} گەورەترین ئایەتی قورئانە، ئەمە هانمان دەدات بۆ خوێندنەوەی تەفسیرەکەیی و ڕامان و بیرکردنەوە لەو هۆکارەی کە ڕزگارکەری مرۆڤە لە سزای ناو گۆڕ، ئەمە بۆ هەموو ئایەت و سورەتەکانی تریش بەهەمان شێوەیە وەک: {الفَاتِحَةِ، البَقَرَةِ، آلِ عِمْرَانَ، الفَلَقِ، النَّاسِ}، ئەگەر لێیان ورد ببینەوەو گەورەیی و پلەو پایەیان بزانین، ئەمە هانمان دەدات بۆ زیاتر ڕامان و وردبونەوەمان لە قورئانی پیرۆز.

دەی کەواتە بگەڕێن بەدوای پلەو پایەی سورەت و ئایەتەکانی قورئاندا؟ چونکە ئەمە چاکترین یارمەتیدەرە بۆ هاندانت لەسەر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزو لەبەرکردنی.

## گەڕانەوە بۆ تەفسیر بۆ تێگەیشتن لەواتای ئایەتەکان

خوای گەورە چەندین نیعمەتی زۆری بەسەردا ڕژاندوین کە لە ژماردن نایەن، لە گەورەترینی ئەو نیعمەتانەش بریتییە لە دابەزاندنی قورئان بەزمانی عەرەبی، ئەمەش لە دیارترین نیعمەتەکانی قورئانی پیرۆزە، خوای پەروەردگار لە قورئاندا بەپێغەمبەری ئازیز(ﷺ) دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴿٥١﴾﴾ العَنكَبُوت: ٥١.

واتە: ئایا بۆ ئەوان بەس نییە کە ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ و دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا، بەڕاستی لەم قورئانەدا بەزەیی و پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ باوەڕداران.

خوای گەورە بەم شێوەیە منەتی خۆی ڕژاندوە بەسەرمانداو، وەک ئەوەی پەروەردگار بیەوێت ئەوەمان بۆ ڕوون بکاتەوەو هەواڵمان بداتێ بەوەی گەورەترین نیعمەت بەسەر عەرەبەکانەوە دابەزاندنی قورئانە بەزمانەکەی ئەوان، وەک دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴿٢﴾﴾ يُوسُف: ٢.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴿٣﴾﴾ فُصِّلَت: ٣. واتە: ئەمە پەڕاوێکە بەڵگەکانی ڕوونکراوەتەوە {لێک جیا کراوەتەوە} قورئانێکە بەزمانی عەرەبی بۆ گەلێک کە شارەزان و دەزانن. بەو واتایەی بەشکوم بزانن کە ئەمە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە، ئەگەر بەڕاستی دەیانەوێ شوکرانەبژێری خوا بکەن بەرانبەر ئەم نیعمەتە گەورەیەی کە بەسەریدا ڕژاندوون.

## گوێگرتن لە قورئانی پیرۆز

لـە گرنگتریـن ئـەو هۆکارانـەی کـە یارمەتیدەرن بـۆ ڕامـان و وردبونـەوە لـە قورئـان: بریتییـە لـە دیاریکردنـی کاتێکـی تایبـەت بـۆ گوێگرتـن لـە قورئانـی پیـرۆز، کەواتـە: یـەک لـە قورئانخوێنـە دەنگخۆشـەکان هەڵبژێرەو لـە کەشـێکی ئارامـدا گـوێ بـۆ چاکتریـن و گەورەتریـن وتـە بگـرە کـە فەرمایشـتی {رب العالمين}ـە.

ئەگـەر تێبینـی ئەوەتـان کردبێـت مـن وتـم لـە کەشـێکی ئارامـداو بەجوانـی گوێتـان هەڵخـەن و مێشـک و دڵ و دەرونتـان بکەنـەوە بـۆ قورئانـی پیرۆز، نـەک گوێگرتنێکـی ئاسـایی؟ چونکە خـوای گـەورە بـەم شـێوەیە فەرمانمـان پێدەکات، وەک دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذَا قُـرِئَ ٱلْقُـرْءَانُ فَٱسْـتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُـواْ لَعَلَّكُـمْ تُرْحَمُـونَ﴾ الأعـراف: ٢٠٤. واتـە: کاتێک قورئـان خوێنـرا پێویسـتە گوێـی لـێ بگـرن و بـێ دەنگیـش بـن، بـۆ ئـەوەی خـوا میهرەبانیتـان لەگەڵدا بـکات.

گومانـی تێدا نیـە کـە خـوای پـەروەردگار بـەردەوام ڕەحمـەت و میهرەبانـی بـۆ بەندەکانـی دەوێـت، وەکاتێـک بـە {فَٱسْـتَمِعُواْ} فەرمانمـان پێدەکات، لەسـەرمان پێویسـتە جیـاوازی بکەیـن لەنێـوان {السـماع - الإستماع}، {السـماع} : بـەو مانایـە دێـت و گوێگرتـن کـورت دەکاتـەوەو تەنها گوێچکەکانـی بەکار دەهێنێت، بـەڵام وشـەی {الإستماع} بەمانـای گوێگرتنێکـی گشـتگیر دێـت بەئامادەیـی دڵ و عەقڵـی بـۆ ڕامـان و وردبونـەوە لەقورئانـی پیـرۆز، دواتـر خـوای گـەورە فەرمانێکـی تریشـمان پێدەکات و دەفەرمـوێ: {وَأَنصِتُـواْ: بـێ دەنـگ بن}، لەسـەرمان پێویسـتە لەکاتـی گوێگرتنمـان بـۆ قورئانـی پیـرۆز بەکـردەوە ئـەم فەرمانـەی خـوای گـەورە جێبەجـێ بکەیـن و بـێ دەنـگ بیـن.

# بەشی چوارەم

# کۆسپ و لەمپەڕەکانی بەردەم ڕامان لە قورئان

لەپێشەوە باسی گرنگی و سودەکانی ڕامان و وردبونەوەمان کرد لە قورئانی پیرۆزو، ئاماژەمان بە زۆر هۆکار کرد کە یارمەتیمان دەدەن لەسەر ڕامان لە قورئان، بەڵام ئەوەی تا ئێستا باسمان نەکردبێت کۆسپ و لەمپەرەکانی بەردەم ڕامانن لە قورئانی پیرۆز.. بەڵێ گومان لەوەدا نیە چەندین ڕێگر هەن کە دەبنە کۆسپی بەردەم دڵ بۆ ڕامانی لە قورئانی پیرۆز، هەروەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾﴾ مُحَمَّد: ٢٤.

هەرکەسێک قورئان بخوێنێتەوەو هەست بەچێژەکەی نەکات و، لە دڵییەوە ڕوو لەخوای گەورە نەکات و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەبێت و، بەڕاستی لە مەبەستی پەروەردگار تێ نەگات، ئەوە با بزانێت کە چەندین قوفڵ لە دڵی دراون، سەرئەنجام تەگەرە دەکەوێتە نێوان ئەم و کردەوەی چاکەوە، بۆیە پێویستە لەخۆی بپرسێتەوەو پێداچونەوە بکات و خۆی لەو قوفڵانە ڕزگار بکات کە ژمارەیان زۆرەو لە نمونەی ئەو قوفڵانەش وەک:

## ١ تاوان و سەرپێچی

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿..وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ..﴾ البَقَرَة: ٢٨٢. واتە: ...لەخوا بترسن، ئەوە بەبێ گومان خوای گەورە فێرتان دەکات... پێویستە ئەو ڕاستییە بزانین کە ڕامان و تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، زانست و دیارییەکەو خوای گەورە بەکەسێکی دەبەخشێت کە شایستەی ئەو دیارییە بێت، لەوەش دڵنیابە بەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوا ئەو زانست و زانیارییەت لەکیس دەچێت؟ چونکە زانست و زانیاری شەرعی نورو ڕۆشناییەو

خوای گەورە دەیخاتە دڵی مرۆڤەوەو، تاوان و سەرپێچیش هۆکاری بێبەش بوونی مرۆڤە لەو زانستە، وەک ئیمامی شافعی دەفەرمویٚ:

شَكَوتُ إِلى وَكيعٍ سوءَ حِفظي فَأَرشَدَني إِلى تَركِ المَعاصي
وَأَخبَرَني بِأَنَّ العِلمَ نورٌ وَنورُ اللَهِ لا يُهدى لِعاصي

ئەی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنیتەوە! ئەی ئەو کەسەی قورئان لەبەر دەکەیت! ئەی ئەو کەسەی کە دەتەویٚ وردبییتەوە لە قورئان! وریابەو خۆت لەتاوان و سەرپێچی بپارێزە؟ چونکە خوای گەورە لە قورئاندا ئەوەی بۆمان ڕوون کردوەتەوە کە تاوانەکان دابڕان لەنێوان ئێمەو قورئاندا دروست دەکەن، وەک دەفەرمویٚ: ﴿ٱسۡتَحۡوَذَ عَلَيۡهِمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمۡ ذِكۡرَ ٱللَّهِۚ..﴾ المُجَادلَة: ١٩. واتە: {بەجۆرێک} شەیتان بەسەریاندا زاڵ بوو، کە یادی خوای لەبیر بردوونەتەوە...
پێویستە ئەو ڕاستییە بزانین هەموو تاوان و سەرپێچییەک کە ئەنجامی دەدەین دواجار کاریگەری لەسەرمان دروست دەکات بۆ ڕامان و تێگەیشتنمان لەقورئانی پیرۆزو لەبەرکردنی ئایەتەکانی، هەروەها تاوان کاریگەری هەیە لەسەر خشوع و ئارامی و ملکەچیمان لەکاتێکدا کە دەچینە خزمەتی قورئان.

## ٢ بێئاگایی

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمویٚ: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ١ مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ٢ لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ..﴾ الأنبيَاء: ١ - ٣.

ئەگەر بەجوانی لە مانای ئایەتەکە ورد ببینەوە، ئەوا بۆمان دەردەکەویٚت کە هۆکاری پشت هەڵکردنی خەڵکی لە قورئان بریتییە لە گاڵتەو گەپ، دەبێت لەوە دڵنیابین کە خاوەنی ئەم جۆرە دڵانە

بە گوێچکەکانیان گوێ لە قورئان دەگرن، بەڵام قورئان ناگاتە دڵەکانیان!؟ چونکە ئەگەر مرۆڤ بەئامادەیی دڵەکەیەوە گوێ لە قورئان بگرێت، ئەمە ئاراستەی دەکات تا پەیامەکەی خوا لە ڕەوشت و کردارو گوفتاریدا ڕەنگ بداتەوە.

## ٣ حەسودی و خۆبەگەورەزانین

حەسودی و خۆ بەگەورە زانینی مرۆڤ لە ئاست وەرگرتنی حەق و گوێگرتن بۆی، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَـٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ..﴾ الأعراف: ١٤٦. واتە: لایان دەدەم لە بەڵگەو نیشانەو ئایەتەکانم، ئەوانەی کە خۆیان بەگەورە دادەنێن لەسەر زەویدا بەناهەق و ناڕەوا...

سوفیانی کوڕی عویەینە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ئەم جۆرە کەسانە تێگەیشتنی قورئانیان لێ دادەماڵرێت.

## ٤ زیادەڕەوی لە دەربڕینی پیتەکاندا

زیادەڕەوی کردن لە دەربڕینی پیتەکانداو دوودڵی لەشوێن و مەخرەجی دەربڕینی پیتەکە، ئەمەش بەمانای ئەوە نایەت کە واز بهێنی لە فێربونی زانستی تەجوید، نەخێر!! چونکە لە پێشەوە ئاماژەمان بەوەدا کە دەنگ خۆشی و تەجویدو جوان خوێندنەوەی قورئان، لەو هۆکارانەن کە یارمەتیمان دەدەن لەسەر ڕامان و وردبونەوە لە قورئان، بەڵام هەندێک قورئانخوێن لەخوێندنەوەی قورئاندا زۆر لەخۆیان دەکەن و سەرئەنجام بەم هۆکارەوە نایانپەرژێتە سەر ڕامان و وردبونەوە لە قورئان کە ئەمەش کارێکی هەڵەیە.

## ٥ سەرقاڵبون بەهۆكارەكانەوەو بێئاگابون لە ئامانجەكان

سەرقاڵبون بەهۆكارەكانەوەو بێئاگابون لە ئامانجەكان لە نمونەی ئەوانەش وەک ڕاپۆرت و توێژینەوەکان، کە لە بنچینەدا هۆکارن بۆ تێگەیشتن و ڕامان لە قورئانی پیرۆز، لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە کە واز بهێنین لە توێژینەوەو ئەو زانستانەی کە خزمەتی ئاین و ئوممەتەکەمان دەکەن، نەخێر.. بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە ئەمانە بکەینە هۆکارو نەیانکەینە ئامانج و، نەبنە بەربەست لەنێوان مرۆڤ و پەیامی خوادا کە قورئانی پیرۆزە.

لە کاتی سەردانەکەمدا بۆ شاری مەدینە، دەربارەی ئایەتی: ﴿قُلْ هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾﴾ صٓ: ٦٧ - ٦٨. پرسیارم لە {شێخ صالح المغامسي} کرد دەربارەی وشەی {مُعْرِضُونَ}؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی: { نَبَأٌ عَظِيمٌ } ڕاوبۆچونی جیاوازی لەسەرە، بەڵام زۆرینە لەئێستادا پێیان وایە مەبەست لەمە قورئانەو، کاتێک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ﴾ ئەمە وەسفە بۆ هەواڵەکە، واتە: ئەم قورئانە پەڕاوێکی گەورەیەو، بەهۆکاری بێئاگاییتانەوە ڕێزو پلەو پایەی ئەم قورئانە نازانن! لێرەدا پەیامەکە بۆ بێباوەڕانی قورەیشە کە پشتیان هەڵکرد لە هەموو ئەو ڕاستییانەی کە لە قورئاندا هەواڵیان پێ درابوو دەربارەی ڕاستی و دروستی و چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی و زیندوبونەوەو لێپرسینەوەو هەواڵدانی قورئان دەربارەی ئوممەتە پێشووەکان و بەڕاست زانینیان و...

ئەگەر هەڵێنجان بۆ ئەم ئایەتە بکەین دەتوانین بڵێین: ئەم پەیامە گوناهبارانی ئەهلی ئیمانیش دەگرێتەوە کە قورئان دەخوێننەوەو لێی ورد نابنەوەو پشتی تێدەکەن، پشتهەڵکردن لە قورئان لێرەدا بەو مانایە نایەت کە قورئان بەڕاست نازانن، نەخێر.. بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئایەتەکانی قورئان دەخوێننەوەو بەڵام بەکردەوە لە ڕەوشت و هەڵسوکەوتیاندا داواکاری ئایەتەکان جێبەجێ ناکەن.

# کۆتایی



نامـەوێ بەتەنها ئەم کتێبە بخوێنیتەوە، بەڵکو دەمـەوێ لەگەڵ خوێندنەوەیدا بیکەیتە پرۆگرامێک خـۆت و کەسـانی دەوروبـەرت جێبەجێی بکـەن، ئەمـە ئەزموونـم بـوو گواسـتمەوە بـۆ ئێـوەی خۆشەویست، بەو ئومێدەی «وشـەیەکی، ڕسـتەیەکی» ئـەم کتێبـە هاندەرتـان بێت بـۆ لەبەرکردنـی قورئانـی پیـرۆز.

ئومێدەوارم ئـەم چەنـد لاپـەڕە سـادەیەی بەردەسـتتان سـودبەخش بێـت بـۆ گـەورەو بچـوک و کـچ و کـوڕو لەشسـاغ و نەخۆشـتان... هـەروەک شـێخ صالـح المغامسـي وتـی: خوێندنـەوەی قورئانـی پیـرۆز لـە دونیـادا عیبـادەت و بەندایەتـی و نزیـک بوونەوەیـە لـە خـوای گـەورە، بـەڵام لـە ڕۆژی دوایـی دا بـۆ خۆشـی و شـادی و پایـەداری دەخوێنرێتـەوە.. چونکە بەهەشـت شـوێنی ئـەرک و تەکلیف نیە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بـە قورئانخوێـن دەوترێـت: (قورئـان بخوێنـەرەوەو بـەرز بـەرەوە، بێگومـان شـوێن و مەنزڵـی تـۆ لـە کۆتـا ئایەتـە کـە دەیخوێنیتـەوە). پێویسـتە ئـەو ڕاسـتییە بزانیـن کـە دڵـی مـرۆڤ هاوشـێوەی گۆزەیـە، تـۆ بڵێـی چ شـتێک لـەوە پیرۆزتـرو گەورەتر بێت کـە دڵـت بـە قورئـان پـڕ بکەیتـەوە.

